


# کەسایەتیی
# تاکی عێراقی



## دکتۆر عەلی وەردی

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە: مەودوود جەبار





ADIBAN

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوران

پەیوەندی: 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369.

Email: bookadiban@gmail.com
Facebook: https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

ناونیشان: کەسایەتی تاکی عێراقی.

نووسەر: دکتۆر عەلی حسێن وەردی.

وەرگێرانی: مەودوود جەبار.

هەڵەچن: موحەممەد قارەمان.

بابەت: کۆمەڵناسی.

ژانر: ڕۆمان.

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم.

بەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

ساڵی چاپ: **2020**میلادی.

تیراژ: **1000** دانەی لێ چاپکراوە.



## وەک پێشەکی[1]

بانگەشەی ئەوە ناکەم کە ئەم وتارە تێرە و تەسەلە و گشت مەرجە زانستییەکانی تێدایە.

لەوانەیە دروست بێت ئەگەر بڵێم: پتر لە وتارێکی ئەدەبی دەچێت وەک لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی.

پاساو و پۆزشیشم بۆ ئەوە بریتییە لە: ئەمە خۆی لە بنەڕەتدا وتارێکە بۆ ئاهەنگێکی گشتی نووسراوە و مەبەست نەبوو کە بکرێتە پەرتووکێکی ئاوەها، وەک ئەوەی ئێستا -تۆی بەڕێز دەیخوێنیتەوە-.

کەواتە ئەمە بۆ خرۆشاندنی بیر و شێوانی خەیال نووسراوە. هەر بۆیە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و تەواوکەر نەنووســــــراوە و بەشبەش و دەلاقەدەلاقە نەکراوە کە بەشەکانی پەیوەندییان بە یەکەوە هەبێت.

ڕەنگبێ خوێنەر چاوی بە هەندێک بابەتدا هەڵتەقێت کە نەتوانرێت بخرێتە نێو یەک سیستەمی تێر و پێک پەیوەندەوە.

---

[1]- ئەم وتارەم لە یەکێک لە ئێوارە کۆڕەکاندا پێشەکەش کرد، کە مێژووەکەی خۆی لەنیو سەدە داوە. نووسەر

هەرچۆنێک بێت، خوێنەر پاش خوێندنەوەی، لەوە تێدەگات کە بە شێوەیەکی گشتی، پەرتووکەکە دەکرێت بە دوو بەشی سەرەکییەوە:

لە بەشی یەکەمدا، دەمەوێت باسی کەسایەتی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی بکەم، بەڵام لە بەشی دووەم یان کەرتی دووەمی کتێبەکەدا مەبەستمە بەناو شادەمارەکانی کەسایەتی تاکی عێراقیدا گوزەر بکەم و بیخوێنمەوە.

هەروەها خوێنەر دەبینێت بەشی یەکەمی پەڕاوەکە درێژدادڕترە و، تاوناتاوێکیش لە بابەتەکە چووینەتە دەرێ.

ڕاستییەکەیشی هیچ داوای عەفوو بۆ ئەمەیان ناکەم، چونکە لەوانەیە هەر خۆم مەبەست و ئامانجم بووبێت وەها کارێک بکەم. ئەوەیش تێگەیشتم کە: ناتوانم لەسەر کەسایەتی تاکی عێراقی بنووسم تا نەیەم و لەسەر کەسایەتی مرۆڤ بە گشتی نەنووسم.

ئینجا، لێکۆڵینەوە لەسەر کەسایەتی تاک بە شێوەیەکی گشتی لە زمانی عەرەبیدا بە باشی نەکراوە، زۆربەی ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان کردووە یان وەرگێڕانیان ئەنجام داوە، زۆربەی هەرە زۆریان پسپۆڕی زانستی دەروونناسین. ئەوەیش واتە: تەنیا لە ڕوانگەی تاکەوە

تەماشای کەسایەتییان کردووە و بە لای بسابەتی کۆمەلایەتییدا بایان نەداوەتەوە مەگەر زۆر بە کەمی.

پێویستیشە ئەوە بڵێین کە: ئەو کەسایەتییەی لە زانستی دەروونناسیدا باسی دەکەین، جیاوازە لەو کەسایەتییەی لە زانستی کۆمەڵناسیدا یان لە زانستی شارستانیدا باسی لێ دەکرێت.

دەروونناسی وەک بوونەوەرێکی خۆڕاگر "قائم بذات" تەماشای مرۆڤ دەکات، هەر بۆیە لە کەسایەتی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە لە ڕووی هەندێک تایبەتمەندییەوە کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە. ئەم پێناسەکردنەیش لە ڕاستییەوە دوور نییە، واتە بەشێک لە ڕاستیی لە خۆیدا هەڵگرتووە.

بەڵام زانایانی کۆمەڵناسی وەها تەماشای مرۆڤ دەکەن کە: لە زۆر ڕووەوە مرۆڤ نوێنەر و نیشاندەری وێنەی کۆمەڵگەکەیەتی. تەنانەت ئەمڕۆکە گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە تاک و کۆمەڵگە دوو ڕووی یەک هەقیقەتن. یان وەک ئەوەی "کۆلی" دەڵێت: "تاک و کۆمەڵگە دووانەیەکی پێکەوە لەدایکبوون".

لەم سۆنگەیەوە: کەسایەتی مرۆڤ لەو قالبانەوە دەردەچێت کە کۆمەڵگە نەخشی کێشاوە.

هەربۆیە دەبینین تاکەکانی کۆمەڵگەیەک لە زۆرێک لە تایبەتمەندییەکانیاندا وەک یەکن. ئەوان لە هەندێک تایبەتمەندیی گشتییدا جیاواز دەبن و هەر ئەوەیش وا دەکات هەر کەسێک لە کەسەکانی دیکە جیاواز بێت و

کەسایەتییەکی تایبەتی هەبێت، بەڵام سەرەنجام لە هێڵە سەرەکییەکاندا لەیەک دەچن.

وا گومان دەکەم لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا توانیبێتم سەرنجی خوێنەر ڕاکێشم بۆ ئەم جۆرەیان لە کەسایەتی. ئەوەیشی نیشان بدەم کە چۆن تاک، بەرهەمی کۆمەڵگەکەی خۆیەتی، ئەو کۆمەڵگەیەی کە تێیدا دەژی.

بۆیە لەو بەشەدا، لایەنی تایبەتی کەسەکانم پشتگوێ خستووە و، پتر سەرنجم داوەتە سەر لایەنی کۆمەڵایەتی. ئینجا لێرەیشدا بانگەشەی ئەوە ناکەم کە پراوپڕ پێکاومە و سەر دڵی نێچیرم ئەنگاوتووە، بەڵکو تاکە مەبەستم ئەوەیە، ئاگایی خوێنەر بەو ئاڕاستەیەدا ڕاکێشم کە ڕەنگە پێشتر بەقەد پێویست ڕانەکێشرابێت.

ئەوەیش بڵێم: کاتێک خۆم تەرخان کرد بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر تاکی عێراقی، تووشی چەند تەنگ و چەڵەمەیەک بوومەوە، تەنگ و چەڵەمەی بچووکیش نا، هی گەورە. ئەوەیش ئەوەبوو کە هەندێک تایبەتمەندی لە تاکەکانی ئەم نیشتمانەدا هەبوون کە لە هیچ کۆمەڵگەیەکی دیکەدا نەبینراوە.

زۆرێکیش لە توێژەر و لێکۆڵەران، ئیدی چ عێراقی، چ ناعێراقی، هەوڵیان داوە ئەو تایبەتمەندییانە کەشف بکەن. هەر کامێکیشیان شتێکی وتووە و دەست کەوتووە کە ئەوی دیکە نەیوتووە و دەستی نەکەوتووە.

وەک پزیشکێک، هەوڵی زۆریان دا دەردەکە دیاری بکەن و بزانن چییە؟ بەڵام، بەداخەوە، لەسەر ڕێوشوێنێک کۆک نەبوون تا بۆ دەردەکە بگەڕێن. هەیانبووە ئەدیب بووە، هەیشیانبووە مێژوونووس، گەڕیدە یاخوود ڕۆژهەڵاتناس بووە، کەمترینیان هەوڵیان داوە لە ڕووانگەی دەروونناسی، کۆمەڵناسی یاخوود شارستانییەتناسییەوە بە شوێن نیشانەکانی دەردەکەدا بگەڕێن و قامکی لەسەر دانێن. زۆرینەیان وەک ئەو کەسە وا بوون کە نەخۆشێکی خراپێتە بەردەست و بیەوێت پشکنینی بۆ بکات لە کاتێکدا سەرە واوێک لە زانستی پزیشکی لە سکیدا نەبێت.

ئەم نووسراوە، سەرەڕای تێدابوونی چەندین کەموکورتی دیار و بەرچاو لە لایەنی زانستییەوە، بەڵام ئەمە هەوڵێکی تاکەکەسییە تا کۆمەڵگەی عێراقی بخاتە ژێر پشکنینەوە و لە سایەیەوە تێبگەین کە کەسایەتی تاکی عێراقی چۆن پێدەگات و گەشە دەکات، پشکنینەکەیش لەژێر سایەی زانستی کۆمەڵناسی هاوچەرخدا ئەنجام دەدرێت.

ئەوەیش بڵێم: بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە، عەزێت و شەونخونی وەهام کێشاون کە ناکرێ بە کەم تەماشا بکرێن و گاڵتەیان پێ بکرێت.

لە ڕاستیدا ئەم ڕێگەیەی کە پێیدا ڕۆیشتم، نە چرایە، نە ڕێنوێنێ، هیچ هیچی تێدا نەبوو تا بەرچاوی خۆمی پێ ببینم و ڕێم نیشان بدات، وەک ئەوەی بەم

هەنگاوانەم ڕێگەیەکم دروست کردبێت کە بەر لە خۆم، کەسی پێدا نەڕۆیشتبێت و ڕێگوشادکەری بە تەنیا خۆم بم.

هەرچۆنێک بێت، ئەمە هەوڵێکی خۆمە و تکایشم وایە لە خوێنەر، بە چاوی ڕەخنە و دیدەی پڕ لە گومانەوە تەماشای بکات. لەوانەیە هەڵەم نەکردبێت ئەگەر وتبێتم: یەکەم کەسم ئەم ڕێگەیەم تەی کردووە و باری سەفەرم بۆ پێک ناوە.

ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم هەوڵە، هەوڵێکی بێ هەڵە و پەڵەیە لە ڕووی زانستییەوە. کێشەی هەرە مەزنی مرۆڤ ئەوەیە: ڕاستەوخۆ ناتوانێت بگاتە چڵەپۆپەی ڕاستی. دەکرێت بڵێین: بۆ گەیشتن بە ڕاستی، هەڵە پێویستە، یان **هەڵەکردن ڕێگەی ڕاستییە.**

بۆیە ئەوەی لەم توێژینەوەیەدا مەبەستمە، هاندانی بێجگە خۆمە تا ملی ئەم ڕێگەیە بگرن و ببێتە ئیلهامبەخش و هۆکاری کرانەوەی مێشکی بیریارەکانمان تا لە بورجە عاجییەکانیان کەمێک دابەزنە خوارێ و چاوێک بە کۆمەڵگەدا بخشێنن بە شێوەیەک کە خۆیان لە سیل و دەرد و سووک و سەلیمییەکانی کۆمەڵگە دوور بخەنەوە.

عەلی حوسێن وەردی

## بەڕێزان! خۆشەویستان!

باشـــترە بەرلەوەی لەبـــارەی کەســـایەتی تـــاکی عێراقییەوە، پێنووس بخەینە سەر تێنووس، بڕێک لەبـارەی کەسـایەتی مـرۆڤەوە بە گشـتی بـدوێین. پێناسـەی کەسـایەتی لای ڕای گشـتی بە شـێوەیەکە کە جیاوازە لەو پێناسەیەی کە لای زانایان هەیە.

خەڵکـی هەر وا دەمیـان ڕاهـاتووە دەڵـێن: فـلانە کەس شەخسـییەتی -کەسـایەتی- هەیە و فیسـار شەخسـییەتی نییە. وەک ئەوەی کەسایەتی شتێکی وەک جـوانی بێـت؛ لای هەنـدێک ئامـادە و لای هەندێکیش ئامادە نەبێت.

لە ڕاســتیدا، هەر کەس لە ئـێمە کەســایەتییەکی تــایبەت بە خۆمــان هەیە. کەس نیــیە بەبـێ شەخسییەت -کەسایەتی- مابێتەوە. جیاوازییەکە لە هێـز و جۆری کەسـایەتییەکەدایە، نەک لە هەبـوون یان نەبوونیدا.

ئەوەیـش بڵـێم: ئـێمە لێـرەدا باسـی بەهێـزی و بێهێـزی کەسـایەتییەکان نـاکەین، ئەوە بـابەتێکە کە ڕەنگە کاتێکی دیکەی بۆ تەرخان بکەین و بە باشی

خوێندنەوەی بۆ بکەین. ئەوەی ئێستا دەمانەوێت وەبەرباسی بخەین، بریتییە لە ناوەڕۆکی شەخسییەت، واتە چۆنییەتی کەسایەتی، کەسایەتی بە شێوەیەکی گشتی چییە؟ و، تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیش تێبگەین بە شێوەیەکی وردتر.

لەوانەیە یەکێک لە ئێوە بپرسێت: ئەو شتە چییە کە ئێوە ناوتان لێناوە کەسایەتی؟ ئەگەر هەریەک لە ئێمە کەسایەتییەکی هەیە، ئادەی پێمان بڵێ لەکوێیە با بیبینین؟

ئەی سەرچاوەکەی کامەیە؟ لەکوێوە سەری هەڵداوە؟ چۆن دەتوانین لە دەروونماندا هەستی پێ بکەین و دەرکی بکەین؟

جارێکیان، یەکێک لە دۆستان چپاندی بە گوێمدا وەک ئەوەی نەیەوێت کەس بزانێت یان گوێی لێبێت: "براگیان! زۆر لەبارەی کەسایەتییەوە دەبیستم، خۆیشم وا نیشان دەدەم کە تێیدەگەم و دەزانم چییە لە ترسی ئەوەی گاڵتەم پێ نەکەن و پێم نەڵێن نەزان، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، تەپی لێ ناپێکم. دەکرێت شتێکم لەو بارەیەوە پێ بڵێیت تا منیش لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بکەومە باس‌وخواس لەبارەیەوە؟"

خـوێنەرانی بەڕێـزا![٢] ئەوەی ڕاسـتی بێـت، ئەو هاوڕێیە ئەو پرسیارەی بە تەنگەوە نام لە کاتێکدا کە خۆیشـم هەر هێنـدەی ئەوم لـێ دەزانـی. هەرچۆنێک بێت هەوڵم دا چەند پێناسەیەکی باوی لەبارەی کەسایەتییەوە بە گوێدا ڕادێرم. ئەو هیچم لێ تێنەگەیشت یان ڕاستترە بڵێم: خۆیشم لە خۆم تێنەدەگەیشـتم. ئینجـا چەنـد سـەعاتێک هەر وا مشـتومڕمان بـوو بەبـێ هـیچ ئەنجامێـک و سەرەنجامی کاریش گەیشتە ئەوەی دان بە نەزانی خۆمدا بنێم لە بەردەمیدا و پاشان بە ئیسراحەت بۆی بخەوم.

ئەم نمـوونەیە، تەقـریبەن وێـنەی زۆربـەی ڕۆشـنبیر و خوێنـدکارەکانمانە لەبـارەی بـابەتی کەسـایەتییەوە. ئومێـدەوارم ئێسـتا بتـوانم کەمێک باشتر لەو کاتەی کە بۆ ئەو برادەرەم باس کرد، بۆ ئێوەی باس بکەم.

ئاسـان نییە هەسـتین بە دیاریکردنی کەسـایەتی یـان پێناسـەیەکی گشـتگیری پڕاوپـڕی بکەیـن لە

---

[٢] - خۆی لە ڕاستیدا، بنەڕەتی کتێبەکە لەبەر ئەوەی وتاری دەنگییە و دواتر نوسراوەتەوە، دەڵێت: ئامادەبووانی بەڕێز، بەڵام ئێمە کردوومانە بە خوێنەری بەڕێز.

ڕاستیدا وەک کارەبا و موگناتیس و ئەسیر و ئەو شتانە وایە، لە ڕێگەی جێکەوتەکەیەوە دەناسرێتەوە و پێی دەزانرێت.[3]

کارێکی دژواریشە کە بێین و کەسایەتی بۆ توخمە سەرەکییە پێکهێنەرەکانی شی بکەینەوە. خۆ ئەگەر هەستاین بە شیکردنەوە و جیاکردنەوەی توخمە پێکهێنەرەکانی لە یەکدی، ئەوا هەموو پەیوەندی و بەهاکەی لەدەست دەدات. کەواتە ئەمە وەک پێکهاتەیەکی کیمیاوی وایە کە هەڵگری تایبەتمەندییەکی تایبەت بە خۆیەتی کە جیاوازە لە تایبەتمەندی هەریەکێک لە توخمە پێکهێنەرەکان بەتەنیا.

دەکرێت بە پوختی پێناسەی کەسایەتی بکەین و بڵێین: "کۆمەڵەیەکی ڕێکخراوە لە بیر و مەیل و حەز و خوو کە کەسێک لە کەسێکی دیکە جیا دەکاتەوە."[4]

هەردوو بیریار "مۆری و کلۆکۆهن" دەڵێن: **کەسایەتی مرۆڤ، پێکهاتەیەکی حەرەکی و**

---

[3]- تەماشای "محمد عطیة الأبراشی، الشخصیة،" لاپەرە ٩ بکە.

[4] -K. Young, Personality, p٣.

هەوڵێکی بەردەوامە بۆ ئەنجامدانی ڕێککەوتنێک لەنێوان حەزە سروشتییە مرۆییەکان و یاسا کۆمەڵایەتییە سەپێنراوەکاندا[٥].

مرۆڤ لەدایک دەبێت و یەکدنیا حەز و مەیل و پاڵنەری ئاژەڵییانەی ناتێروتەسەلی بە میرات بۆ جێ دەمێنێت. پاشان ئەو حەز و مەیل و پاڵنەرانە دەخاتە نێو قاڵبی بەها شارستانییەت و کۆت و بەندە کۆمەڵایەتییەکانەوە. ئیدی هەر لەو چرکەیەوە منداڵ لە هەوڵی دروستکردنی ڕێککەوتنێدیکدا لەنێوان ئەم حەز و پێویستییە کاتییانە و ئەو داخوازییانەی کە کۆمەڵگە بە سەریدا دەیسەپێنێت.

کەسایەتی یان شەخسییەت بریتییە لە ململانێی بەردەوامی ئەو دوو جەمسەرە دژیەکە. ئەو هێزە ئاژەڵییەی ناو دەروونی مرۆڤ لە کۆت و بەند حاڵی نابێت. هێزەکەی دیکەیش، هێزی کۆمەڵایەتی، دەیەوێت سایە و سێبەری خۆی بەسەر ئەو هێزە خراپەی دیکەدا بدات و بیکاتە نێچیری خۆی و، بە کەیفی خۆی بەو قاڵبە شارستانییە پەسەندە کاڵا بۆ باڵای بدورێت.

---

[٥] -Klucjhohn & Murrary, Personality... p. ٢٧

فرۆیدیش دەڵێت: کەسایەتی بریتییە لە ململانێی نێوان دوو خود: خودی باڵا و خودی پەست "نزم."[٦] خەڵک هەیە دەتوانێت ڕێکەوتننامە لەنێوان ئەو دوو هێزە دژیەکەدا بەرپا بکات و کەسایەتییەکی هاوسەنگ بۆ خۆی بەرهەم بهێنێت، هەیشە توانای هاوسەنگکردنی نییە و، سەرەنجام یان شێت دەبێت، یان تاوانبار، یاخوود گاڵەچی و دەستدرێژیکار و ڕقن.

جێگەی سەرنجە کە پیاوانی ئاینی و بیریاران لە کۆندا، هەستیان بەم ململانێ دوو جەمسەرییە کردووە و، وایان داناوە کە دەروونی مرۆڤ مەیدانی ململانێیەکی توندی "هیدایەتی خوایی" و "فریوەکانی شەیتان"ـە؛ یان وەک ئەوەی فەیلەسووفەکان دەڵێن: ململانێی نێوان وەحی عەقڵ و پاڵنەری سۆزە "عاتیفە."

بەڵێ! لە کۆندا، پێشینانمان درکی ئەم هەقیقەتەیان کردبوو لەبارەی کەسایەتییەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لەوەی بێنوو خوێندنەوەیەکی واقیعییانە بۆ

---

٦- سێ کەسایەتی لە تیۆرییەکەی فرۆییددا هەن: من، ئەو، منی باڵا. یان وا ڕاستترە بوترێت: کەسایەتی لای فرۆید دەکرێت بە سێ جەمسەرەوە، من، ئەو و منی باڵا.

کەسایەتی بکەن. ئەوان سەری زمان و بنی زمانیان هەر خوێندنەوەی ئامۆژگاری وتار و ئامۆژگاریکردنی خەڵکی بوو کە پێیان دەگوتن: ئاقڵ بن و چاک بن و خراپ مەبن بەبێ ئەوەی بۆ یەک چرکە ڕامێنن لە هۆکاری ئەوەی بۆچی زۆرێک لە خەڵکی شوێن تەوژمی سۆز کەوتوون و وازیان لە عەقڵ هێناوە؛ یان بە شێوەیەکی دیکە: بۆچی شوێن فەرمانەکانی شەیتان کەوتوون و وازیان لە ڕەحمان هێناوە؟

دەگێڕنەوە کابرایەکی نەخوێنەواری دەشتنشین بەلای کتێبخانەیەکی هەرە گەورەدا تێپەر بووبوو، هەر وا لەبەر خۆیەوە بەدەنگی بەرز هاواری کردبوو: من دەزانم ئەم کتێبانە هەموویان چی دەڵێن؟ پوختەی گشتیان ئەوەیە "**یا إبن ادم، کن خیرا- ئەی مرۆڤ ببە بە کەسێکی چاک**" یان بە لەهجە دەشتەکییەکەی خۆی وتوویەتی "**یابن ادم، صیر خوش ادمی.**"

قسەی ئەم دەشتەکییە، هەر بە ڕاستی بەسەر هەموو ئەو نووسین و وتارانەدا جێبەجێ دەبێت کە پێشینان نووسیویانە و وتوویانە. هەر بە ڕاستی ئەوان ئەو کەلەبەرەیان لێ ون بووە کە تایبەتە بە

کەسایەتی مرۆڤەوە و ئەویش بریتییە لەوەی کە: فەرمانەکانی خودا هیچ نین بێجگە ئەو فەرمانانەی کە کۆمەڵگە و تەقالید و نموونە باڵاکە "المثل العليا." ئەو تەقالید و نموونە باڵایەیش سست نابێت لەناو دەروونی مرۆڤدا تا ئەو کاتەی دەبینین مرۆڤەکە شوێن هەوەسە ئاژەڵییەکانی دەکەوێت.

کەواتە گرفتەکە بریتی نییە لە ململانێی نێوان عەقڵ و عاتیفە وەک ئەوەی پێشینان وایان زانیبوو. بەڵکوو بریتییە لە لەبەریەکهەڵوەشان و شیبوونەوەی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەی کە مرۆڤی تێدا دەژی.

ئەو کاتەی کە کۆمەڵگە لەبەریەک هەڵدەوەشێت بە هۆی پەیوەستبوون و دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگەکانی دیکەدا، ئەو کاتە نموونە باڵا تایبەتەکەی لاواز دەبێت و، تاکەکانیشی ئیمانیان پێی نامێنێت و بە کەیفی خۆیان سەر دەکەنە ناو هەوا و هەوەسە ئاژەڵییەکانیانەوە سەرەڕای ئەو هەمووە ئامۆژگاریی و وتارە.

سەرباری ئەوەیش، پێشینانمان بڕوایان وا بووە کە مرۆڤ تا دوایین ڕاددەی ئازادی، ئازادە لە هەڵبژاردنی خوڵق و خووەکانیدا، واتە: ئەو

دەتوانێت شەخسییەتی خۆی بپارێزێت لە ئالوودەبوون و بەو شێوەیەی بەرهەم بهێنێت کە خۆی دەیەوێت، دەتوانێت هەموو ئاکار و خووە جوانەکانی لێ بار بکات و هەرچی پەستی و پیسیشە لێی دەربهێنێت -وەک سرنج- وەک ئەوەی کەسایەتی چەشنی پارچە مۆمێک بێت، چۆنی بوێت، ئاوای لە قاڵبی بدات. بەڵام ئەوەیان بیر چووەتەوە کە کەسایەتی لەناو کەشوهەوا و ژینگەیەکدا پێک دێت کە ناتوانرێت جێکەوتی ئەو ژینگەیەی لەسەر لاببەرێت، ئیدی چ ئامۆژگاریکار ئامۆژگاری بخوێنن یان فەیلەسووفان وانەی ئەخلاق بڵێنەوە.

دروستبوون و سەقامگیربوونی کەسایەتی بەو پێوەرە لۆژیکییە ڕەهایانە ناپێورێت کە فەیلەسووفەکان خەیاڵی بۆ لێ دەدەن. کەسایەتی، چەمک و مەسەلەیەکی ڕێژەییە، کاتێکیش کەسێک لەناو کۆمەڵگەیەکدا پەروەردە دەبێت و بە بەند و بار و ڕێوشوێنەکانی ئەو ڕادێت، قسەیەکی بێمانایە بێین و داوای ئەوەی ئەوەی لێ بکەین کە بە گوێی قسەی حەکیمەکان بکات کە بە تەواوەتی پێچەوانەی ئەوەیە کە لەسەری ڕاهاتووە.

ئەوەی مایەی شانازییە ئەوەیە کە شارستانییەتی ئیسلامی، بیریارێکی هەرە باشی بۆ بەرهەم هێناوین، جیاواز لە بیریارەکانی پێش خۆی. ئەم بیریارە هەوڵی داوە کەسایەتی مرۆڤ لە ڕووانگەی واقیعەوە بخوێنێتەوە، نەک وەک ئەوانی دیکە لە سۆنگەی وتار و ئامۆژگارییەوە. ئەو کەسەیش عەبدووڕەحمانی کوڕی خەلدوونە "ئیبنوو خەلدوون".

ئیبنوو خەلدوون وا تێگەیشتووە کە: خەڵکی سارانشین لەو سەردەمەدا، زۆریان حەز لە کاولکاری و، زۆریشیان ڕق لە زانست و پیشەوەری بووە. بۆیە بە شێوەیەک بەرگرییان لێ دەکات کە هەر دەڵێیت نەریتی زانایانی کۆمەڵناسی هاوچەرخە. ئەو دەڵێت: بیاباننشین، کەسانی پاڵەوان و داگیرکەرن، ستەم قەبووڵ ناکەن و زۆر بۆ دراوسێ چاکن. ئەم تایبەتمەندییانەیش لەگەڵ فێربوونی زانست و ئارامگرتن لەسەر پیشە و میهنە و هونەرەکانی بیناسازیدا یەک ناگرنەوە.

بە بڕوای خەلدوون، کاتێک مرۆڤ لەسەر ڕێچکەیەک دادەمەزرێت و سەقامگیر دەبێت، زۆر سەخت دەبێت بۆی دەسکاری ئەو سروشتە بکات

و خـۆی بخـاتە سـەر ڕێچکەیەکـی دیـکە. هەر لەم سۆنگەیەوە خەلدوون ئەو ئەنجامگیرییە دەکات کە:

گەڕان بەدوای زانسـت و خـۆفێرکردنی پیشـە و میهـنە و ئەم شـتانە، سـیفەتی گەلە ژێردەسـتەکانن چـونکە ئەو پیشـانە پێویسـتیان بە لەسـەرخۆیی و سـەردانەواندن و سـەبر و تـاقەت و سەرشـۆڕیی هەیە، پێچەوانەی سیفەتی بیابانشینە کە هەمیشە لە سەرکەوتن و پاڵەوانێتییدایان بەسەر دەبەن.

بە بڕوای خەلـدوون، مرۆڤ ناتوانێت لە هەمان کاتدا پاڵەوانێکی شمشێر بەدەست و فێرخوازێکی زانسـت و زانیـاری بێت. هەورەوەک چۆن ناتوانێت پـێکەوە پـاڵەوانێکی ملشـکێن و پیشـەوەرێکی کارامەیش بێت.

هەروەهـا خەلـدوون ئەوەیشـی سـەلماندووە کە: زانسـت و پیشـە و هـونەر تەنیا لەو کۆمەڵگەیـانەدا پەرە دەسـێنێت کە لە یەکـدی هەڵوەشـاون و لە هەمانکاتیشـدا خەریکی تـاوان و بەرەڵایـی و کـاری سووکن.

دیسانەوە ئەو وای دەبینێت کە کۆمەڵگەی عەربی کـۆچەر کە خـاڵییە لە زانسـت و پیشەسـازی، لە هەمانکاتیشـدا خـاڵییە لە بەرژەوەنـدییە کەسـی و

هۆکارە سووک و ڕەزیلەکان. عەرەبی کۆچەر لە دیدگای ئەودا، پاکترین سروشتی هەیە و ڕۆحی نزیکترینە لەوەی کە ئایین پەسەند بکات و لەچاو شارنشیندا خاوەن فەزیلەتیشە. وەک ئەوەی کاتێک کۆمەڵگەی شارستان خەریکی برەودانە بە پیشە و هونەر و زانست، لە هەمانکاتیشدا برەو بە بەرەڵایی و بێئەخلاقی و تاوان و جەریمە دەدات[٧].

*** *** ***




[٧]- ابن خلدون، المقدمة ص ١٢١.

ئەم تیـۆرییە، سـەرەڕای لاوازی ڕووکەشی بە گـوێرەی شارسـتانییەتی نـوێ، بەڵام وردییەکی زۆری تێـدا بەخەرج دراوە لەبـارەی کەسـایەتی شارسـتانییەتی کـۆنەوە؛ هەروەهـا بە لێدانێکی بەهێـزیش هەژمـار دەکرێـت بـۆ سـەر گیانی ئەو بیرکـردنەوە کـۆنەی کە وای دەزانـی مـرۆڤ بەدەستی خۆیەتی چۆن کەسایەتی خۆی بنیات دەنێت و چەندە چاکە لە خۆیدا بەرجەستە دەکات.

ئەم تیـۆرییەی خەلـدوون چەشـنی سـکڵێکی گەشـاوەی ژێـر پـلوپووشـە کە کەمێـک ڕۆشـن بوویەوە و دواتر بە خێرایی خامۆش بوو. دیارە کە بە چەنـدین سـەدە پـێش سـەردەمەکەی خـۆی کەوتـووە و خەڵکیش بابەتەکەیـان بیرچـوویەوە وەک چۆن ناوی ئیبنوو خەلدوون خۆیشیان لەبیر بـردەوە. بیریـار و ئامۆژگاریکـارانیش گەڕانەوە سەردەمی بەر لە خەلدوون و دیسانەوە دەستیان کـردەوە بە خوێنـدنەوەی ئامۆژگـاری و وتـنەوەی[٨] وانەی لۆژیک.

ئیدی مرۆڤایەتی لای بەلای بـابەتی کەسـایەتییدا نەکـردەوە تـا گەیشـتینە سـەردەمی ژیـانەوەی

---

[٨] -W. E.Sargent, Teach yourself Psychology p.٩

ئەورووپی. لەوێوە پەرچەکردارێکی توند سەری هەڵدا ئیدی بیرکردنەوەکانی سەردەمانی پێشتر کە وایان دەزانی مرۆڤ ئازادە لە دروستکردنی کەسایەتی خۆیدا. ئەمان وتیان کەسایەتی چەشنی ئامێرێکی میکانیکییە و هیچ دەسەڵاتێکی بەسەردا ناشکێت و هیچ ئازادییەکیشی نییە. بە بڕوای ئەوان کەسایەتی ئامرازێکە بەدەست چوارتێکەڵەکەی لەشەوە "خوێن و بەڵغەم و زەردایی و ڕەشایی."

ئەوجا لە هەر کەسێکدا یەکێک لەم چوارە لەوانی دیکە پتر گەشە بکات، ئەوا کەسایەتییەکەی دەبێتە هەڵگری ئەو تایبەتمەندییە. بۆ نموونە کەسایەتی زەردایی، ئینکارە، خێرا هەڵدەچێت و ئیرادەیەکی بەهێزی هەیە لە کاتێکدا کەسایەتی بەڵغەمی، لەسەرخۆیە، کاروباری بە سەردا کەڵەکە دەبێت و تەوەززەلە. کەسایەتی خوێنی کەسایەتییەکی ڕووخۆشە، متمانەی بە خۆی هەیە و گەشبینە بەپێچەوانەی کەسایەتی ڕەشاییەوە کە زۆر وەسواس، بێتاقەت و بێ حەوسەڵە، بێئومێد دەکەوێتە بەر چاوان[9].

---

[9]- دکتۆر محمود حب الله، الوجدانیة والعقیدة الدینیة، ص ٣٥ و دواتر.

هیچ نکۆڵییەک لەوەدا ناکرێت کە ئەو تیۆرییەی کە باس کرا، ئەوە نەبێت لە سەردەمی ژیانەوەی ئەورووپیدا داهێنرابێت، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانی کۆن کە ئەوسا تەنیا لە بواری پزیشکییدا بەکار دەهێنرا، بەڵام زانا کۆمەڵناسەکان گەشەیان پێدا و لە بواری کۆمەڵناسییشدا وەگەڕیان خست.

پێویستە ئەوەیش بڵێین: ئەمڕۆکە زۆر گرنگی بەو تیۆرییە نادرێت لە فەرمانگە زانستییەکاندا چونکە وای دەبینن کە لەسەر بنچینەیەکی هەڵە دارێژراوە، بەڵام بۆ سەردەمی خۆی گرنگی و پێگەیەکی تایبەتی هەبووە لەوەدا کە توانیویەتی ناسینی کەسایەتی بهێنێتە ژێر سایەی واقیع و لەژێر سایەی ئامۆژگاری و وانەی لۆژیک بیهێنێتە دەرێ و چیدی شین و واوەیلای نموونەی باڵای نەکەن.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمیشدا مەسەلەی ڕژێنە ناوەکییەکان سەری هەڵدا. ئەم تیۆرییەیش لە ڕوواڵەتدا زۆر لە تیۆرییەکەی پێشوو "تیۆریی چوار تێکەڵەکان" دەچوو. بەڵام پشتی بە چەند لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دەبەست کە نەدەکرا پشتگوێ بخرێت و گومانیشی قەبووڵ نەدەکرد.

ئیدی هەندێک لە زاناکان ئەوەندە بوونە لایەنگری و بە ڕاستیان دەزانی تا وای لێهات ناوەکەی لە "ڕژێنە ناوەکییەکان"ەوە بوویە "ڕژێنە کەسییەکان."[10]

ئیدی کارەکە وای لێهات، هەر کەسێکیان ببینیایە کە زیرەک بووایە یان ژنێک لاسایی پیاوی بکردایەتەوە، یاخوود کەسێک زۆر ئازا و پاڵەوان بوایە، ئەوا خێرا مەسەلەکەیان دەلکاند بە یەکێک لە ڕژێنەکانەوە، ئیدیٚ ڕژێنی نوخامی، ئەدرینال یان دەرەقی یان ڕژێنی زاوزێوە.

ئەم ئاڕاستەیە لە ڕاڤەی کەسایەتییەکان لەسەر بنەمای ڕژێنە ناوەکییەکان زیادەڕۆییەکە کە چیدی زانایانی کۆمەڵناس کاری پیٚ ناکەن.

خۆ ئەوان هیچ نکۆڵییەک لە هۆکارە بایۆلۆجییەکان ناکەن کە کار دەکەنە سەر کەسایەتی مرۆڤ، بەڵام هێندە هەیە کە ئەوە ئەوان نین بڕیاری یەکلاکەرەوە دەدەن و کەسایەتییەکە دەخەن بە لادا.

---

[10]- دکتۆر صبری جرجیس: مشکلة السلوک السیکوپاثی، ص ١٩٦.

زۆربەی کات ئەو هۆکارە بایۆلۆجییانە کارلێک لەگەڵ هۆکارە ژینگەییەکاندا دەکەن بە چەندین شێوە. ئەوەتا زۆرجار دەبینین کەسێک بە میراتی بایۆلۆجی، چەند سیفەتێی: تورەبوون و خێراهەڵچوون و، زوو تۆڵەسەندنەوەی بۆ دەمێنێتەوە، کەچی لەناو کۆمەڵێکدا دەژی کە زۆر گرنگی بەو لایەنانە نادەن و بەلایانەوە گرنگ نییە، بۆیە دەبینین دۆخە بایۆلۆجییەکەی دەگۆڕێت بۆ دۆخێکی دیکە و ڕێگەیەکی دیکە دەگرێتەبەر و، وای لێ دێت: حەز دەکات خەڵکی لێی بدەن بەڵام ئەم لەوان نەدات و ئازاریان نەدات.

هەروەها دەبینین کەسێک هەیە زۆر زیرەک و مێشک پڕ، کەچی لەناو کۆمەڵگەیەکدا دەژی کە هەموو هۆش و گۆشێکیان بەلای هێز و بازووەوەیە، بۆیە ئەمیش هیچ داهێنان و فەلسەفەیەکی لێ ناوەرێت.

هەیە تووشی جۆرێکی سووک لە شێتی و سەرگەرمی دەبێت، هەر ئەم کەسە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێت، لە هەندێک کۆمەڵگەدا ڕێزی دەگرن و کەمێکیش

پیرۆزی دەکەن، لە هەندێکی دیکەیشدا خێرا دەبنە نەخۆشخانەی دەروونی.[11]

ئێمە دەتوانین هۆکارە بایۆلۆجییەکان بچوێنین بە ماددەیەکی خام، هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانیش بە کارگەیەک کە لەو ماددە خامانە چەندین جۆر کەرەستە دروست دەکات. لێرەوە کەسایەتی بریتییە لە بەرەنجامی کارلێکی هەردوو هۆکارەکە، نەک یەکێکیان بە تەنیا.

بەڵێ! ڕاست ئەوەیە بڵێین: کەم تا زۆر بریتییە لە ئەنجامی هەڵشێل و داشێلی ئەو ماددە خاوانە لەناو کارخانەکەدا.

"مۆتران" وەک نموونە باسی ئەوە دەکات کە: کەمی ڕژاندنی ڕژێنەکان لە بەشی پێشەوەی نوخامەڕژێن، وا لە مرۆڤ دەکات کە قەزەم -کولەبن- دەرچێت. تێبینی ئەوەیش کراوە کە هەندێک جار قەزەمەکان مەیلیان بەلای بالای بەرز و ڕێکدا هەیە لەگەڵ فیتنەجۆیی. بەڵام ئەوە ڕاست نییە بوترێت: کەمی چالاکیی نوخامەڕژێنەکان هۆکاری سەرەکی فیتنەییکردنە. بەڵکوو

---

[11] - R.linton The study of Man, Ch. ٣١.

ڕاستییەکەی ئەوەیە بڵێین: کاریگەری ژینگە کۆمەڵایەتییەکە وای کردووە لە کەسی کورت وا بیر بکاتەوە و حەزی لە فیتنەیی بێت، خۆ ئەگەر لە ژینگەیەکی دیکەدا گەشەی کردبا کە پتر سۆز و خۆشەویستی تێدا ڕەچاو کرابا، لەوانەیە ئەویش جۆرێکی دیکە لە دنیای ڕوانیبا.[١٢]

هەر جۆرێک بێت! ساڵانێکی زۆر و زەوەند بەسەر زانایاندا تێپەری و ئەوان هەر نەکەوتن بە لایەکدا کە ئایا کام لەو دووانە "ژینکە یان بۆماوە" کاریگەری زیاتریان هەیە لەسەر بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤ.

لە سەرەتاوە زانایان مەیلیان بەلای کاریگەری پاڵنەرە بایۆلۆجییەکاندا دەڕۆیشت، بەڵام ئەمڕۆ، گرنگییەکی بێشومار بە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان دەدەن و، پێناسەی کەسایەتی بەوە دەکەن کە: بریتییە لە کارلێکی بەردەوامی نێوان پاڵنەرە بایۆلایەتییەکان[١٣].

[١٢] - Mottran, The physicul Basic of Personality, P ٥٧.

[١٣] - بایۆلایەتی: بایۆلۆجی+کۆمەڵایەتی.

بەڕێزان! وا گومان نەکەن کە نهێنی کەسایەتی مرۆڤ لەلایەن زانایانەوە کەشف کراوە و ئیدی گەیشتوونەتە کۆتایی ڕێگەی تێگەیشتن. پێویستە بڵێم: هێشتایش بەشێکی هەرە گەورەی کەسایەتی لەژێر تەم و مژدا ماوەتەوە.

تیرل لە کتێبەکەیدا بە ناوی "کەسایەتی مرۆڤ" دەڵێت: لە ناوەوەی ناو دەروونی مرۆڤدا هێزێکی دەرائاسا هەیە کە سنوورەکانی کات و شوێن تێدەپەڕێنێت و بە هیچ شێوەیەک لە ڕێگەی ئەم یاسا سروشتییانەوە ناتوانرێت ڕاڤەی نهێنییەکانی بکرێت.

تیرل دەڵێت: تەماشای ئەو سەماکەرە سەرسامکەرە بکە کاتێک هەڵدەستێت بە کردنی چەند جووڵەیەکی هەماهەنگی یەکتەواوکەر بە شێوەیەک کە هەر ماسولکەیەک لە کاتێکی دیاریکراودا دەجووڵێت کە هیچ لە ڕێکوپێکی ماسولکەکانی دیکە کەم ناکاتەوە، یان بڵێین: ڕیتمەکە تێک نادات. سەرەنجام دەبینین یەک سەمای تێروتەسەلی سەرسووڕهێنەر نمایش دەکات. ئێستا ئەگەر بێین و پرسیار لە سەماکەرەکە بکەین، ئەوە چۆن ئاوا بەو تەسەلییە سەما

دەکەیت؟ لە وەڵامدا دەڵێت: خۆیشم نازانم چۆن دەیکەم! ئەو خۆی لەسەر سەما ڕاهێناوە و خووی پێوە گرتووە، ئینجا لە ناخییەوە ئەو هێزە شاراوەیەی دەرپەڕاندووە.[١٤]

هەمان شتیش بۆ شاعیرێک، پێغەمبەرێک، میوزیکژەنێک، یان زانایەک ڕاستە. هەریەک لەمانە، هێزێک لە ناوەوەی ناو دەروونیاندایە کە خۆیشیان توانای ڕاڤەکردنیان نییە. بۆ نموونە چلۆن ڕاڤەی سەمفۆنیاکانی بتهۆڤن، تیۆرییەکانی نیوتن، داهێنانەکانی ئەدیسۆن یاخوود نووسینەکانی شکسپیر بکەین؟

ئایا ئەو بەرهەمە نەمرانە، بەری درەختی حساباتێکی وردە یان هۆکارگەلێکی دیاریکراو یان تێکۆشانێکی بەئاگایانەیە بە تەنیا؟[١٥]

ئایا دەتوانین پێغەمبەرایەتی جەنابی موحەممەدەل موستەفا بەو شێوەیە لێک بدەینەوە کە زانایانی کۆمەڵناس دەڵێن کە گوایە تێکەڵەیەکە لە کارلێکی میرات و کۆمەڵگە؟

---

[١٤] - Tyrrell, Personality of Man, P ٢٥.

[١٥] - Sorokin, The Crisis of our age, Ch.. ٣.

ئێوە پێمان بڵێن: چۆن ڕاڤەی هێزی ئەو کەسانە دەکەن کە خەوانـدنی موگناتیسـی دەکەن و شـتە شاراوەکان کەشف دەکەن؟ یان چۆن ڕاڤەی کاری ئەو کەسـە بکەیـن کە لەنێـوان دوو پەنـجەرەدا دەفرێت؟ یان ئەو کەسـەی بەردێک یـان بێگیانێک بانگ دەکات و ئەویش دێت بۆلای؟

من خۆم کەسێکم بینی کە لە یەک کاتدا یەکدنیا ژمارەیان خستە بەردەستی و ئەویش لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەنجامی هەمووی بە دروستی وت.

زۆرجـار کە هەوڵ دەدەیـن ئەو دیـاردانە ڕاڤە بکەیـن لە ڕێـگەی بەخشـینی چەنـد نـاو و دەسـتەواژەیەک و ئیـدی ئاسـوودە دەبـین وەک ئەوەی گرفتەکەمـان چارەسـەر کردبێـت و نهێنییەکەیمان دۆزیبێتەوە. بۆ نموونە بە یەکێک لە دیاردەکان دەڵێین خەواندنی موگناتیسی، جادوو، بلیمەت، پێغەمبەرایەتی، یان هەر شتێکی دیکە کە هیچ لە ماناکەی تێناگەین و نازانین چییە.

بەڵێ! بەشێکی زۆری کەسایەتی مرۆڤ شاراوەیە و هێشتایش پەردەی نهێنیی بە سەردا دراوە، بەلام ئـێمە سـەرەڕای داننانمـان بەوەدا، هەر بەردەوام دەبـین لە گەڕان بەدوای دۆزیـنەوەی کەسـایەتی

مرۆڤدا لەو لایەنە زانراوەوە کە دەکرێت توێژینەوەی لەسەر بکرێت و کاریگەرییەکانی سەریشی بزانرێت و دیاری بکرێت.

خۆ ئەگەر چاو بپۆشین لەو شتە ئاسابەدەرانەی کە هەندێک کەس پێی هەڵدەستن، دەبینین کەسایەتی مرۆڤ هیچ نییە بێجگە لە کارلێکی بەردەوامی نێوان پاڵنەرە بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکان.

پێویستە لێرەدە ئەوەیش بڵێین کە کەسایەتی بە تەنیا تایبەتە بە مرۆڤ، ئاژەڵ و چوارپێ کەسایەتی نییە و منداڵیش ناتوانێت کەسایەتی هەبێت لەو کاتەی کە لەدایک دەبێت، بەڵکوو وردەوردە کەسایەتی بۆ خۆی بنیات دەنێت.

چەند ساڵێک لەمەوبەر، یەکێک لەو زانایانەی کە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە، کتێبێکی نووسی لەسەر "کەسایەتی ئاژەڵان." بەڵام ئەم ناونیشانە هەڵەیەکی تێدایە و، وەک گوتمان ئاژەڵان کەسایەتییان نییە. ڕاستە لە هەندێک لە ئاژەڵەکاندا وەک سەگ و ئەسپ و مەیموون شتێک هەیە وەک بڵێیت کەسایەتییە یان شتێک لەو بابەتە، بەڵام ئەگەر جوانتر لەو نیشانانە ورد بینەوە، دەبینین بریتین لە چەند وەڵامدانەوەیەک. ئێمە لە واقیعدا کەسایەتی خۆمان دەبەخشینە ئاژەڵەکان لەو کاتانەی کە هەندێک تایبەتمەندی تێدا دەبینین وەک زیرەکی و ویژدان. واتە ئێمە بە هەمان ئەو شێوەیەی کە ڕاڤەی کردارەکانی خۆمان دەکەین، دێین و ڕاڤەی کردارەکانی ئەوانیش دەکەین و

لەوێوە دەمانەوێت کەسایەتییەکی پێوە هەڵواسین، لە کاتێکدا ئەوان چەشنی گورگ لە کورەکەی یەعقوبی نەبی بەرین.

بەڕێزان، کەسایەتی تایبەتە بە مرۆڤ و لەوانەیشە لە هەندێک گیانلەبەردا چەند نیشانەیەک لە سەرەتاکانی کەسایەتی تێیاندا بەدی بکرێت. ئەو گشتە شێوە و ڕەنگە جیاوازەی شارستانییەت و بیرمان پێشکەش بکات.

دکتۆر یوسف موراد لەم بارەیەوە دەڵێت: "... مانا کاملەکەی کەسایەتی ئەوەیە کە هەست بە بوونی خود بکرێت، خۆ ئەگەریش وامان دانا هەندێک لە ئاژەڵە تایبەتەکان ئەو تایبەتمەندییەیان تێدایە کە هەست بە خۆیان بکەن، ئەوا دەچینە سەر مەرجی دووەم کە ئەستەمە لە ئاژەڵدا هەبێت، ئەویش هەبوونی نموونەی بالایە کە لە سەرەوەی خۆیەوە دای بنێت و بیەوێت پێی بگات."[16]

لێرەدا پێویستە شتێکیش بڵێین، ئەوەیش: کەسایەتی بەخششێکی خودایی نییە کە مرۆڤ بە تەواوەتی لە باوانییەوە بە میرات بۆی بمێنێتەوە

---

[16]- یوسف مراد، مبادء علم النفس العام، ص ٣٣٩

وەک میراتییەکـانی دیـکە. لە واقیعـدا بـابەتێکی وەدەستخراوە و لە کۆمەڵگەدا گەشە دەکات، ئەگەر کۆمەڵگە نەبێت، کەسایەتییش بوونی نابێت.

ئەگەر مـرۆڤ هەر لە بەرایـی تەمەنیـیەوە لەنـاو چەنـد ئاژەڵێکدا پەروەردە ببێـت، ئەوا نە هەسـت بە کەسـایەتی خـۆی دەکـات و نە هەسـت بە زاتـی خۆیشی تێدا دەرسکێت.

هەروەهـا ئەوەیـش چەسـپاوە کە دەکرێـت کەسایەتی بکرێت بە چەند بەشێکەوە یان ببێت بە چەنـد دانەیەکەوە. زۆرێکـیش هەن کە لەلایەن زانایـانەوە دۆزراونەتەوە کە دوو یـان چەنـد کەسایەتییەکیان هەیە.

دکتۆر برنس تـوانی بە ڕێگەیەک کە لە خەواندنی موگناتیسـی دەچێـت، وا لە کچێـک بکـات کە دوو کەسایەتی هەبێت. ئەو کاتەی کە کاری بە یەکێکیان دەکرد، ئەوی دیکەیانی ڕادەوەستاند لە کارکردن.[17]

دکتۆر سـارجنت، زانـای دەروونناسـی هـاوچەرخ، خۆی خاتوونێکی بینیوە کە خاوەنی دوو کەسـایەتی بـووە. ئەو چـووەتە وێسـتگەی شـەمەندەفەر بـۆ

[17]- محمد عطية الأبراشي، الشخصية، ص ٢٢٦- ٢٢٧.

ئەوەی ماڵاوایی لە مێردەکەی بکات و پاش چەند کاتژمێرێک، خۆی لە شارێکی دیکە بینیوەتەوە کە کچێکە و ژیان بەسەر دەبات لە ماڵێکدا بەبێ ئەوەی هیچ هەست بەوە بکات کە ئەوە ئەو بوو ئەمڕۆ سەرلەبەیانی ماڵاوایی لە مێردەکەی کرد.[18]

خۆ ئەگەر ئێمە بمانەوێت لەم دیاردە سەیروسەمەرە تێبگەین، دیاردەی چەندکەسایەتی، یان دابەشبوونی کەسایەتی، ئەوا لە پێشدا دەبێت کەمێک لەسەر مەسەلەی خودی کەسایەتی و سەرچاوەی گەشەسەندی ڕامێنین.

زاناکان دەڵێن: چەقی کەسایەتی بریتییە لە هەست بە خود -شعور بذات- یان ئەوەی کە پێی دەڵێین نەفس. ئێمە مەبەستیشمان لە نەفس ئەو مانا باوە نییە کە خەڵکی بە ڕۆحیش ناوی دەبەن. نەفس ڕۆح نییە، ئەوە هەڵەیەکە کە زۆرێک لە نووسەران تێی کەوتوون.

بەڕێزان! ڕۆح دیاردەیەکی میتافیزیکی یان بایۆلۆجییە کە هیچ شتێکی لەبارەیەوە نازانین، بەڵام نەفس ئەو هەستەیە کە وات لێ دەکات بڵێیت

---

[18] -Sargent, op, cit, p٦٨

"من،" یان خۆتی پێ لە شتەکانی دیکەی دەوروبەر جیا بکەیتەوە.

نەفس چییە؟ ئەی هەست بە "من"کردن چییە؟ ئەوەتا کابرای سەر شەقام، ڕۆژانە پتر لە دە جار دەڵێت "من" و لە چەندین لاوە هیلاک و ماندوو دەبێت بۆ سەلماندنی ئەو "من"ـە. خۆ ئەگەر بێین و لێی بپرسین: ئەو "من"ـە چییە؟ یان ئەوەتا سەری سەرسوڕمان بادەدات یان زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزانەت بۆ دەکات. فەیلەسووفانیش چەندین ساڵیان لەپێناو گەڕان بەدوای ئەو "من"ـەدا سەرف کردووە کە ئایا چییە؟ ئەی چۆن لەناو مرۆڤدا دادەگیرسێت.

دەگێڕنەوە یەکێک لە شێتەکان کە پێیان دەگوت "هەبنەقە" هەستا بە دروستکردنی گەردەنبەنێک –ملوانکە- لە ئێسک و پروسک و زەخرەفە. کاتێک لێیان پرسی بۆچی ئەو ملوانکەیە لە مل دەکەیت؟ وتبووی بۆ ئەوەی خۆمم لێ ون نەبێت و بزانم ئەوە خۆمم. شەو نوست و براکەی بەدزییەوە ملوانکەکەی لە مل داکەند و خستییە ملی خۆی،

کاتێک هەبنەقە خەبەری بوویەوە، بە براکەی وت: براگیان ئەوە تۆ منیت، ئەی من کێم؟[19]

ئەم چیرۆکە لە کتێبە ئەدەبی و گاڵتەئامێزەکاندا دەنووسرێتەوە و بەو هاوڕێیەیشمان دەوترێت شێت و گێل، وەک ئەوەی ئەگەر کەسێک گومان لە "من"ـێتی خۆی بکات، شێت یا گێلە، خۆ ئەگەر وا بێت، ئەوا زۆرێک لە فەیلەسووف و زانا دەروونناس و کۆمەڵناسەکان دەخرێنە ڕیزی گێل و شێتەکانەوە.

فەیلەسووفەکان هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە وێڵی دوای مانای نەفس بوون. بەڵام بە کۆی گشتی، هیچ جیاوازییەکی جەوهەرییان نەکردووە لە مانای چەمکەکەدا لەوەی کە لە واقیعدا و لەناو خەڵکیدا هەیە.

لەڕاستیدا یەکەم بۆمب لەبارەی مانای نەفسەوە لەلایەن فەیلەسووفی گومانکەر "هیوم"ـەوە تەقێنرایەوە. ئەو فەیلەسووفە هەوڵی ئەوەیدا کە بیسەلمێنێت کە نەفس بوونێکی دەرەکی نییە، بەڵکوو بە بڕوای ئەو، بەدوای یەکدا هاتنی بیر و

[19]- یوسف مراد، هەمان سەرچاوە، ص ٣٣٧.

ئەزموونە بە شێوەیەک کە ئەو بەدوای یەکدا هاتنە هەستێک لەبارەی هەبوونی شتێکەوە دەبەخشێت کە خۆی لە هەقیقەتدا بوونی نییە.[٢٠]

هەر لە سەردەمی هیۆمەوە تا ئەمڕۆکە، فەیلەسووفان بە چەپ و ڕاستدا دێن و دەچن تا مانایەک لەبارەی ماهییەتی نەفسەوە وەگیر بخەن و تێبگەن کە چۆن ئەم شتە لە مرۆڤدا پەیدا بووە بەبێ ئەوەی لە ئاژەڵدا هەبێت؟

هەرچۆنێک بێت، تازەترین بیروبۆچوونی زانستی لەبارەی نەفسەوە، ئەوەیە کە کۆچ کردوو "چارلس کۆلی"یە، مامۆستای پێشتری زانستی کۆمەڵناسی لە زانکۆی میشگن، پوختەی ئەوەیشی کە کۆلی لەم بارەیەوە دەیڵێت:

. . . نەفس ئاوێنەی کۆمەڵگەیە، یان بە گوزارشتێکی دیکە: نەفست ئەوەیە کە خەڵکی لەبارەتەوە تێی دەگەن و ئەو ڕۆڵەیە کە لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا پێت دەبەخشن. تۆ کێیت؟ تۆ هەست بە خۆت دەکەیت و دەڵێیت "من" لەو گۆشەنیگایەوە کە خەڵکی تێت دەڕوانن، یان ڕاستترە بگوترێت:

---

٢٠ - Joad Guide to Philosophy, p.٢٣٠ et sep

ئەو هەستەیە کە لە دیدی خەڵکییەوە دەربارەی خۆت هەستی پێ دەکەیت.

مامۆستا "دینیسن" تیۆرییەکەی "کۆلی" بە شێوەیەکی جوان نیشان داوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە دەڵێت: دەکرێت لە هەر مرۆڤێکدا جۆرە جیاوازەکانی ڕەفتار بەرهەم بهێنرێت کاتێک جۆرێکی تایبەت لە نەفسی خۆیت خستە دڵییەوە و لەو شێوەیەی خۆی ئیلهامت بۆ کرد. بۆ ئەو کارەیش نموونەی دوو کەس دەهێنێتەوە کە یەکێکیان نیگای بۆ دێت بە شێوەیەک لە شێوەکان و پێی دەگوترێت کە تۆ کەسێکی خانەدانی ڕۆمانیت و بەوی دیکەیشیان دەگوترێت کە کۆیلەیەکی ڕۆمانییە.

ئەوەیان کە خۆی وەک خانەدانێکی ڕۆمانی هاتبوویە بەرچاو، هەڵدەستا بە هەندێک هەڵسوکەوتی خانەدانانە، بۆ نموونە بڕوای وا دەبێت کە کۆیلە دەبێت بکوژرێت ئەگەر فەرمانبەرداری خاوەنەکەی خۆی نەبێت. کۆیلەیش لەلایەن خۆیەوە وا تێدەگەیشت کە شایەنی کوشتنە ئەگەر بەسەر گەورەکەیدا هەڵداتێ یان بێگوێی

بکات. ئیدی ئەو وای لە خۆی دەڕوانی کە کاڵایەکە بۆ کڕین و فرۆشتن بە دەست گەورەکەیەوە.[٢١]

یەکێک لە زاناکان ئەزموونێکی لە ڕێگەی خەواندنی موگناتیسییەوە ئەنجام دابوو، تێیدا نیگای کردبوو بۆ کەسی خەوێنراو کە زاتی خۆی یان ئەوەی لە جیهانی شیکردنەوە موگناتیسییەکاندا پێی دەگوترێت "Ego" لەناو پەیکەرێکی لە کاغەز دروست کراودایە. کەسی خەوێنراو وەها مامەڵەی لەگەڵ پەیکەرەکەدا دەکرد کە خودی خۆی بێت و تێی چووبێت، غیرەی لێ دەکرد و لێی تووڕە دەبوو کاتێک گاڵتەی پێ دەکرا و، ئازاری دەچەشت کاتێک لێی دەدرا و خۆشحاڵ دەبوو ئەو کاتانەی هۆنراوەی خۆشیان بەسەردا دەخوێندەوە.

ئەمە ڕووداوێکی زۆر سەیروسەمەرە نییە بەڕێزان، هەریەک لە ئێمە چەشنی ئەم کابرایەین، بەڵام بە شێوەی جیاواز جیاواز.

زۆر جار نیگا ئەخرێتە دڵمانەوە کە شتێک یان کەسێک دەبێتە بەشێک لە کەسایەتیمان، وەک ڕۆڵە یان هۆز، زانست، عەقیدە، شار یان هەرشتێکی

---

٢١ -Landis, Social Control, p. ٦٠

دیکە. هەر کاتێکیش یەکێک قسەیەکی ترش و تاڵ بەو کەسە یان شتە بڵێت کە بووەتە بەشێک لە کەسایەتییەکەی، ئەوا لە تووڕەییان ڕەنگی شین و مۆر هەڵدەگەڕێت.

بۆ نموونە دەکرێت هەر ئێستا لەناو ئەم کەسانەی کە ئێستە لێرە ئامادەن، قسەیەک بکەین کە زۆر پێی قەڵس و تووڕە ببێت، تەنیایش لەبەر ئەوەی ئەو وشەیە بووەتە بەشێک لە کەسایەتی بۆی.

ئامادەبووانی بەڕێز، لەڕاستیدا هەمووومان لە هەموو بوارەکانی ژیانماندا، کەوتووینەتە ژێر کاریگەری خەواندنی موگناتیسی و، با لێرەدا ناوی بنێین "**خەواندنی کۆمەڵایەتی**".

منداڵ هەر لەو ساتەی کە چاو بە دنیا هەڵدەهێنێت، خەوێنەرە گەورەکەی کە کۆمەڵگەیە، دەست دەکات بە تێگەیاندن و هێماپێدانی کە فلانی کوڕی فیسار بەشێکی دانەبڕاوی ئەم خێزان و پلەیەیە؛ هەروەها پێویستە لەسەری کە فلانە کار و فیسارە فەرمان جێبەجێ بکات. بەم شێوەیە وەک خەوێنراوێک تەماشای خۆی دەکات وەک چۆن کەسانی دیکە تەماشای دەکەن و وەهایش

هەڵسوکەوت دەکات کە کەسانی دەوروبەری پێی دەڵێن و بە گوێیدا دەچپێنن.

خۆ ئەگەر ئێمە هاتین و خەواندنی موگناتیسیمان بە شێوەیەکی زانستی خوێند، دەبینین لە چەندین لایەنەوە هاوشێوەی خەواندنی کۆمەڵایەتییە: "خەوێنەری موگناتیسی لە هەوڵی خەواندنی کەسێکدایە بە شێوەی دووبارەکردنەوە قسەیەک تا هۆشی خەوێنراوەکە بەلای نوختەیەکی دیاریکراودا ڕاکێشێت کە ئەویش ئەوەیە: "تۆ ئێستا دەخەویت... مامسولکەکانت خاو دەبنەوە... وا لەشت کەمکەم سڕ و وڕ دەبێت... چاوەکانت پڕ بوون لە فرمێسک... پێڵووی چاوت قورس‌قورس بوون... زیاتر قورس دەبن... خەوەکە ڕوون نییە... لەشت پتر سڕ و وڕ دەبێت... پێلوی چاوەکانت تەواو سڕ بوون... زۆر... وەنەوز زۆری بۆ هێناویت و خەوەنوچکە دەتباتەوە... پێڵووەکانت خەریکە پێکەوە دەلکێن... ئێستا پێڵووەکانت لکان بە یەکدا... بە تەواوی پێکەوە نووسان، ناتوانیت بیکەیتەوە مەگەر ئەو کاتەی کە خۆم پێت دەڵێم... تۆ ئێستا نوستوویت، نوستنێکی موگناتیسی خۆش... تۆ

دڵخـــۆش و بەکەیفیـــت... لە خەوەکەتـــدا قووڵبەرەوە...."[22]

ئا بەم شـێوەیە مرۆڤێک بە شـێوەی موگناتیسی دەخەوێنرێـــت: لە ڕێـــگەی پـــێ وتـــن و چەنـدبارەکردنەوەوە؛ ئەو کـاتەی دەخەوێت، ئیدی دەتوانیـت هەرچێکت دەوێـت نیگـای بـۆ بکەیـت و فەرمـانی هەر شـتێکی پێ بکەیت و ئەویش لەپاش بێداربوونەوە پێت بدات. **بێزەحمەت ئێستا پێم بڵێن چ جیاوازییەک لەنێوان ئەم خەواندنە موگناتیسی و کۆمەڵایەتییەدا هەیە؟!**

خەوێـــنەرەکە دەتوانێـــت چەنـــدین ئەزمـــوونی گاڵتەئامێز بەسەر خەوێنراوەکاندا بهێنێت.

بۆ نمـوونە دەتوانێت نیگایان بۆ بکات کاتێک کە بێـــدار بـــوونەوە، ببـــنە مـــاڵات و مەڕ و بـــزن. بە یەکێکیشـیان بڵێت ببێتە شـوانی مێگەل و بە کەیفی خـۆی بیانـداتە بەر. کاتێـک بێـدار دەبـنەوە، هەر بە ڕاستی هەست دەکەن مەڕ و ماڵاتن و لەسەر چوار پێ ڕێگە دەبڕن و بەوپەڕی هێز دەباعێنن باع باع... **مهههەئـــ... مهههههەئـــ... شـوانی بەرخەلـیش بە**

---

[22]- شاکر الخفاجی، کیف تکون منوا مغناتیسیا ناجحا، لاپەرە ٢٥-٢٧

هێواشی و بە نازەوە دەیانلەوەڕێنێت بەو شێوەیەی کە نیگای بۆ کراوە لەلایەن خەوێنەرەکەوە. خۆ ئەگەر لە نیگاکەدا پێی گوترابا بە زەبر و زەنگەوە بیانلەوەڕێنێت، ئەوا هیچ درێغییەکی لەوەیش نەدەکرد.

دەگێڕنەوە کە جارێک یەکێک لە پیاوانی ئاینی دەخەوێنرێت، ئیدی نیگای بۆ دەکرێت کە کاتێک گوێی لە دەنگی چرکەی کاتژمێرەکە بوو، وتارێک لە وەسفی کوفر و زەندەقەدا بۆ ئامادەبووان بڵێت. کاتێک بێدار بوویەوە، هەروەک جاری جاران دەستی بە قسەوباس کرد، بەڵام گوێی لە دەنگی کاتژمێرەکە نەبوو تا هەستایەوە، لەوساوە دەستی کردە خوێندنەوەی وتارێکی پڕ لە جۆشوخرۆش لە وەسفی کوفر و زەندەقەدا.

کاتێک لە وتارەکەی بوویەوە، یەکێک لە ئامادەبووان ڕووی دەمی تێکرد و لێی پرسی: هۆکاری ئەو دژیەکییە چی بوو لە قسەکانتدا؟

هاوڕێ هەژارەکەمان دەستی کردە بەڵگەهێنانەوە، بەڵگەی بنجبڕ بنجبڕ کە نەخێر ئەو هیچ دژیەکی لە قسەکانیدا نەبووە و، هیچ مەبەستێکیشی نەبووە جگە لە خێر.

لەوانەیە بۆ سەلماندنی قسەکانی چەند فەرموودە و ئایەتێکی قورئانیشی وەک بەڵگە هێنابێتەوە.

بەڕێـزان! گـاڵتە بەو هـاوڕێ خۆشەویسـتەمان مەکەن. هەمووومـان وەک ئەو وایـن، بەڵام شـێوازی خەوانـدنەکەمان جیـاوازە. وەک **لانـدرس** دەڵێـت: ئەوەی دەیکەیـن، دەیڵێـین، بیـری لـێ دەکەیـنەوە، هەسـتی پـێ دەکەیـن، هەر لە بەرەبەیـانەوە تـا ئەو دەقەی دەچیـنە جێخەوەکەمـانەوە، ئەوە جێبەجـێ دەکەیـن کە کۆمەڵگە فێرمـان دەکـات و نیگامـان بۆ دەکات، چ لە یاسا و ڕێسا و بەها و نەریتەکان.[٢٣]

لە کاتێکـدا ئەو کـارانە دەکەیـن، دڵـی خۆیشـمان خـۆش دەکەیـن گـوایە ئـازادین. وا دادەنێـین ئەم کارانەمـان کـردووە لە کاتێکدا مەبەسـتمان بـووە و پێشتریش بیرمـان لـێ کردووەتەوە، خولاسـە هەزار جـۆر لەم خەیاڵپلاوییـانە. بەڵام لە ڕاسـتیدا ئـێمە هەمـوو ئەم کـارانە دەکەیـن لەژێـر کـاریگەری خەوێـنەرە مەزنەکەدا، کـۆمەڵگە، دواتـریش وەک کابرا ئایینییە داماوەکە، بە چەپ و ڕاستدا دەکەوینە هێنـانەوەی پاسـاو و گەڕان بە شـوێن بەڵـگە و

---
٢٣ -Landis, op, cit, p٦٦

هەنجەتی ئەوەدا کە نیشانی خەڵکی بدەین تووشی دژیەکی ناوخۆیی نەبووینەتەوە.

پێغەمبەر موحەممەد درووودی خودای لەسەر بێت دەفەرموێت: "خەڵکی خەوتوون، کاتێک دەمرن، بێدار دەبنەوە."

ئێمە تا لەم ژیانەدا بین، لەگەڵ کۆمەڵگەدا و لەناو کۆمەڵگەدا دەژین. بیرکردنەوە و کارەکانمان لەسەر ئەو ڕێورەسمە بەرێوە دەچێت کە هەر لە منداڵییەوە کۆمەڵگە لەناو عەقڵی ناوەکیماندا دەیرسکێنێت و، چ بمانەوێت یان نەمانەوێت لەسەری دەڕۆین تا ئەو کاتەی نەریتێکی جیاواز لەوەی خۆمان، یان کارێک جیاواز لە کارەکانی خۆمان دەبینین، ئیدی لەوێدا تووشی سەرسووڕمان دەبین و گاڵتە و تەشقەڵە بەوانی دیکە دەکەین وەک ئەوەی لەناو ئەو گشت خەڵکەدا، تەنیا ئێمەین لە غەفڵەت دووریـن. لە کاتێکدا هەموومان ئەوەتاین لە غەفڵەتدا، یان وەک ئەوەی پێغەمبەر موحەممەد سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموویێت گشتمان نوستووین و ئەو کاتە بێدار دەبینەوە کە دەمرین. لەوانەیش هەندێک بەلایشیانەوە بەچێژ بێت ئەگەر بە خۆشییەوە بڵێین:

کێ نالّی لەپاش ئەم مردنە، خەوێکی دیکە بمانباتەوە!

کەمێک لەمەوبەر وتمان کە نەفسی مرۆڤ ئاوێنەیەکە بە شێوەیەک کە هەستی کۆمەڵگەکەی دەوروبەری تێدا دەدرەوشێتەوە. ئەوەیش مانای ئەوە نییە کە ئەو ئاوێنەیە ساف و ڕوون و بێخەوشە، لە ڕاستیدا ئاوێنەیەکی پڕ لە گرێ و گۆتاڵ و شوخت و زبرییە.

لەوانەیە منداڵێکی چەوساوەی پشت چەماوە، کە لەژێر سایەی ڕەحمەتی خزم و کەسە منداڵەکانیدا بەردەوام تووشی سووککردن و ئازاردان دەبێتەوە، گرێیەکی قووڵی کوێر لە کەسایەتیدا دروست ببێت کە لە کاتی گەورەبوونیشیدا بە ئاستەم خۆی لێ دارنێت.

ڕەنگە لە گەورەییدا هەندێک تایبەتمەندی بەرز و بەپێزی تێدا دەرکەون کە لەناو خەڵکیدا بیکەنە کەسێکی پایەبەرزی بەڕێزی بەناوبانگ، بەڵام ئەو هەستی خۆبەکەمزانینەی دەورانی منداڵی کە بەردەوام لەگەڵیدا گەورە بووە، ڕێگری لێ بکات لە هەستکردن بەو جێگە و پێگەیە و، بەردەوام بیری بەلای ئەو بەکەمزانینەی دەورانی منداڵی بێت.

پاستۆر، نموونەی ئەم هەست بە کەمیکردنەیە. ڕەنگە هەر لە منداڵییەوە درکی خۆبەکەمزانینی کردبێت. تەنانەت پاش دۆزینەوەی میکرۆبیش کە ناوی کەوتە نێو ناوانەوە و جیهان ناسییان، هێشتایش ئەو هەستەی لە دڵدا مابێت. تەنانەت جارێکیان کە ئاهەنگێکی گەورەی بۆ ساز کرابوو، دەمادەمی هاتنەژوورەوەی بۆ هۆڵەکە، گوێی لە موزیک و چەپڵەڕێزانێکی بەتاو بوو، ئاوڕی لە یەکێک لە دۆستەکانی دایەوە و پرسی: **چما شازادە هاتووەتە ژووری؟** ئەو بەستەزمانە وای زانیبوو ئەو گشتە قاوقیژ و چەپڵەڕێزانە بۆ هاتنەژوورەوەی شازادەیە.

سەیر و سەمەرە لەوەدایە، هەندێک کەس کاتێک گوێیان لە چەپڵەڕێزان دەبێت بۆ شازادە، وا دەزانن نەخێر، ئەو چەپڵەڕێزانە بۆ ئەوانە، **کوردە وتەنی: شێتیش بەهرەیە: الجنون فنون.**

زانراوە کە گرنگترین و کاریگەرترین هۆکار لەسەر بنیاتی کەسایەتی تاک، بریتییە لە یەکەمین کۆمەڵ کە لە سەرتاکانی ژیانیدا لەگەڵیاندا دەژی و گەورە دەبێت.

مەبەستیشم لە کۆمەڵی سەرەتا، تاکەکانی خێزان و گەرەک و قوتابخانەیە. ئەم کۆمەڵە بە شێوەیەک کەسایەتی ئەو منداڵە دادەتاشن کە دواتر گۆڕانکاری تێیدا ئەگەر ئەستەم نەبێت، زۆر سەختە.

منداڵەکە لەگەڵ چاوی بۆ ژیان دەکاتەوە، دەبینێت لەلایەن چواردەورەکەیەوە پێگەیەکی باڵا یان پەستی پێ بەخشراوە. هەر ئەوان بەردەوام و بێپسانەوە ئەو بڕیارە چاک یان خراپانەی لەبارەوە دەردەکەن تا وای لێدێت کەسەکە، بڕوا دەکات بە ئەو قسانەی دەوروبەر لەبارەیەوە دەیڵێنەوە. ئیدی لەسەر ئەم ڕێڕەوە، کەسایەتی ئەو تاکە، لەسەر ئەو خاڵە سەرەکییە دەست بە گەشە و نەشە دەکات، ئەویش پێی دەگوترێت: **ناوکی دەروونی بێدار.**

با دوو نموونەی دیار وەبەرباس بخەین کە ڕۆژانە ڕووبەڕوویان دەبینەوە:

بیهێنە بەرچاوت، تازەلاوێ: لە خانەدانێکی پوڵداری بە شان‌وشکۆ گەورە دەبێت، خۆیشی ڕووخسارێکی گەشاوە و قەدوقیافەیەکی ڕێک و لەباری هەیە؛ پۆشاکی شیک و پۆشتەی پۆشیوە، لەناو خزم و ناسیاراندا پێگە و ڕێزێکی تایبەتی لێ

دەگیرێــت، ئەوە بــێجگە لە خۆشەویســتی و نازکێشـانی دایـک و بـاوکی کە وشـەی زبریـان (گیـانەکەم) و (باوانەکەم)ـە، گـوێی لە هـیچ شتێکی دیکە نابێت. گوێ لە قسەی دەگیرێت، دەنگی بڵند و پـڕە، هـاوڕێی زۆرە و پشتیوانشـی فـرە. ئەگەر کەسێک پێی بڵێت پشتی چاوت برۆیە، بەجارێ دە کەسی لەسەر دێتە وەڵام. فەرقی نییە چ ستەمکار، چ ســتەملێکراو بێــت. ئـا ئەم کەســە بە متمـانەبەخۆبوونەوە گەورە دەبێــت و گۆشــت دەگرێت، کاتێک دێتە گۆ، وا دەزانێت لە ئاسمانی حەوتەمەوە سرووشی بۆ هاتووە چونکە ڕاهاتووە کە هەرچـی بڵێـت، ئەگەر هەڵیـتوپەڵیـتیش بێـت، خەڵکی هەر پەسـەندی بکەن و نەخێری بە ڕوویدا نەڵێن.

بە شـێوەیەکی گشـتی کەسـایەتی ئەم مێرخاسـە، هەم کـراوە، هەم دڵخـۆش و بەمتمـانە پێـدەگات و دێتە ئاراوە.

بە پێچەوانەکەیشییەوە:

کەســێکی چێرەتـــاڵی دیـــمەن نالەبـــار، کە لە خێزانۆچکەیەکی بێ شێو و نان گەورە دەبێت، دەم ناکـاتەوە، دەکێشـن بە قەپۆزیـدا. هێـدیهێـدی ئەم

کەسە وای لێدێت لە ڕێگەیەکەوە ناوبانگ پەیدا بکات جیاواز لەوەی هاوڕێ و دۆست و هاوهۆزەکانی بەدەستی دەهێنن.

لەناو ئەم تاقمەدا، کەسانی بلیمەت هەڵدەکەون، هەروەک چۆن کەسانی تاوانبار، بوودەڵە، ڕقن و بێمێشک و بیرکۆڵیش پەیدا دەبێت.

ئەم تازەپیاهەڵکەوتووە، ڕووبەڕووی دوو جۆر لە پێزانین دەبێتەوە لەناو کۆمەڵە سەرەتاییەکەی کە تێیدا دەژی. لە دایک و باوکییەوە ڕێز و خۆشەویستی دەبینێت و لە هاوپۆل و هاوکارەکانییەوە بێڕێزی و سووک تەماشاکردن. هەربۆیە هەندێک جار ململانێ لە دەروونیدا سەر هەڵدەدات، بەمەرجێک زیرەکی و دانایی تێدا بێت.

لێکۆڵەران لە هەندێک وڵاتدا گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی کە **ناشیرینی ڕووخسار** یان نەخۆشی، شتێکی زۆر باوە لەناو تاوانبارەکاندا. ئەوان لەوەوە گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی کە ناشیرینەکان هەر بە سروشت مەیلیان بەلای خراپەدا دەخزێت، چونکە بە قسەی ئەوان، ئەوە نیشاندەری نسکۆی بایۆلۆجییە بەرەو سروشتە سەرەتاییە ئاژەڵییەکە. بەڵام ئەو ئەنجامگیرییە

هەڵەیە. هیچ تاوانبارێک بە سروشت، مەیلی بەلای تاواندا ناچێت. لە زۆربەی دۆخەکاندا، تاوان شتێکی دەستخستەنییە -إکتسابی-.

ناشیرینەکان هەر بە سروشت بریتی نین لە کەسانی خراپ، وەک ئەوەی هەندێک لە زیادەڕۆکاران دەڵێن، بەڵکوو هۆکاری کۆمەڵایەتی لە ئارادایە. ئەو لەبەر ناشیرینییەکەی، هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵگە بە تاوانباریان ناساندووە، ئەویش وەک تاوانبارێک گەورە بووە. مەبەستمان ئەوەیە کە: کۆمەڵگە بێزی لەم منداڵە دێتەوە و لەبەر سادەترین کار، دەیسپێرنە بەندینخانەوە و، بە زبرترین زمان و بەهێزترین بازوو دەیدوێنێت و لێی دەدات، ئەو بەستەزمانەیش ناچار دەبێتە تاوانبارێک چ بیەوێت، چ نەیەوێت.

ئەگەر تاوانێک بکات و، دوو کەسیش بەو هۆیە قۆڵبەست کران، یەکێکیان جوان و ئەوی دیکە ڕەزا گران، ئەوا پۆلیس مەیلی بەلای تاوانبارکردنی ئیسکتاڵەکەیاندا دەڕوات و حەز دەکات جوانەکەیان ئازاد بکرێت. خۆ ئەگەر ئەم دووانە بێنە دادگا و بەردەم دادوەر، دادوەریش مەیلی بەلای تاوانبارکردنی ناشیرینەکە و ئازادکردنی

جوانەکەیاندا دەڕوات. کاتێکیش ئەو بەو دیمەن ناشیرینە دەچێتە بەندینخانەوە و، کاتێک هاتە دەرەوە، دەبێتە مامۆستای تاوان چونکە شتانێکی زۆر لە هاوبەندینخانەکانییەوە فێر بووە. ئیدی بە بڕوانامەی دکتۆراوە لە بەندینخانە دێتە دەرێ؛ خۆ ئەگەر ویستی تۆبەیش بکات، ئەوا خەڵک تۆبەکەی لێ وەرناگرن. دیارە کە خەڵکی هەمیشە داوای بڕوانامەی ئاکاری بەرزی لێ دەکەن، ئیدی ئەویش ناچار ببێتە خراپەکارێک.

تازە کۆمەڵگە ئەوی بە تاوانبارێک پێناسە کردووە، ئەویش وێنای خۆی هەر بەو شێوەیە دێتە پێشچاو کە کۆمەڵگە بۆی کێشاوە. بۆیە دەبینین دەگەڕێت بە شوێن ئەو کەسانەی کە هەمان چارەنووسیان بۆ دیاری کراوە. لەوێیشەوە یەک دەستە چەتە پێک دەهێنن، ئینجا لەو کەشە چەتەییەیشدا، دیسانەوە جارێکی دیکە خۆی وەک خراپەکارێک دەر دەخاتەوە. ئیدی ئەم کەسە دەبێتە چەتە و شەقوەشێنێکی گەورەتر. ئا بەم شێوەیە کۆمەڵگە بکوژەکانی خۆی بەرهەم دەهێنێت!

ئەوە هەر ئەو شتەیە کە بە کردەیی بەسەر زنجییەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکییدا دەهێنرێت.

ئاماری لە بەردەست هەیە کە ڕێژەی تاوان لەناو ڕەشپێستەکاندا زیاترە وەک لە سپیپێستەکان. بەڵام ئەوە واتای ئەوە نییە کە ئەوا هەر بە سروشت حەزیان لە تاوانە. نەخێر، لە ڕاستیدا ئەوە واقیعەکەیە وای لێ کردووە مەیلی شەڕەنگێزی تێیدا بگەشێتەوە چونکە سووکایەتی نەماوە کۆمەڵگە پێی نەکات و، لەبەر چکۆڵەترین تاوانیش، خێرا دەیسپێرننە سوچی زیندانەوە. چیدی زیندانیش بۆ ئەو شوورەیی نییە پاش ئەوەی چەندینجار سەردانی کردەوە. ئەو بەستەزمانە، لەبەر ڕەنگی وەک شەو، لووتی پانی یان لێوی هەڵاوساوی، هەر شتێک ببێت، دەخرێتە ئەستۆی ئەو.

هەمان شتیش بۆ هەژار ڕاستە. خۆ نکۆڵی ئەوە ناکەین کە هەژاری خۆی یەکێکە لە هۆکارەکانی تاوان، بەڵام لاوازی هەژار لەبەرانبەر دەوڵەمەندەوە و، کەمی خزم و ناسیاو لە فەرمانگەکانی دەوڵەت، هۆکارگەلێکن بۆ خێراتر تاوانبارکردن وزووتر خستنە بەندینخانەی. هەژاری بێدەرەتان، خوا نەکا قچکەتاوانێک بکات، خێرا دەوڵەت لەسەر سەری پەیدا دەبێت و بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی وڵات، -بە سەد جۆر- خۆیانی لێ سوور دەکەنەوە،

کەچی ئەگەر پارەدارێک تاوانێکی زلیشی لەدەست بقەومێت، ئەوەندە خاوەخاو و گێلەگێل لە پەروەندەکەیدا[٢٤] دەکەن هەر نەبێتەوە.

ئینجا، کابرای پارەدار بە سەری بەرز و سنگی دەرپەڕیوەوە دەچێتەوە ناو خاوخێزانی خۆی و هەژاری بەشمەینەتیش بۆ ناو تاریکی کونجی زیندان.

دەوڵەمەند دەڵێت: هەژار بۆیە هەژارە، چونکە خراپەکارە، چوزانێ هۆکاری خراپەکارییەکەی، خودی هەژارییەکەیەتی.

---

٢٤- پەروەندە: دۆسیە، فایل و دۆکیومێنتی دادگا و شوێنی فەرمی.

هەرچۆنێک بێت، دەتوانین بە یەقینەوە ئەوە هەڵێنجین کە دەروونی مرۆڤ و، ئەو کەسایەتییەی کە لێوەی دەئاڵێت، دروستکراوی دەستی کۆمەڵێکە یان بە پێچەوانەوە. ڕەنگە لێرەدا یەکێک بپرسێت: ئەگەر دەروون، دروستکراوی دەستی کۆمەڵگەیە، کەواتە کێشە چییە ئەگەر مرۆڤ چەند کەسایەتییەکی هەبێت بەقەد ئەو کۆمەڵانەی کە پەیوەندییان پێوە دەکات؟

لەڕاستیدا ئەو پرسیارە، بێجگە لەوەی پرسێکی هەستیارە، دەیشمانباتە نێو مەسەلەیەکی ئێجگار گرنگەوە.

**ویلیام جیمس** دەڵێت: مرۆڤ لەبری یەک دەروون -کەسایەتی- چەند دانەیەکی هەیە.[٢٥] تۆ ئەو کاتەی لەگەڵ کۆمەڵێکدا دادەنیشیت کە جیاوازن لە کۆمەڵێکی دیکە، ئەوا تۆیش جیاواز دەبیت.

چەندە خەندەئامێزە ئەو کاتەی دەبینین کەسێک کراسێک لەبەری لا دەبات و کراسێکی دیکە

[٢٥] -W. James, Psycology, p. ١٧٩..

دەپۆشێت و لەگەڵ گۆڕینی کراسەکەیشدا کەسایەتییەکەی دەگۆڕێت. بە تایبەتی ئەو کاتەی دەیەوێت لە ئاهەنگێکدا بەشداری بکات. هەر لەو ئاهەنگەدا دەبینیت بە شێوەیەک هەڵسوکەوت دەکات کە بە تەواوی جیاوازە لەوەی کە لەناو کۆمەڵەکەی پێشتردا دەیکرد.

ئێستا دەبینین کەسێکی جددی و قورسە، ڕێگری لە هەر زیانێک دەکات بە نیشتمان بگات، بە گژی هەر کەسێکدا دێتەوە کە چاو لە وەتەن زیت بکاتەوە، کەچی هەر ئەم ئاغایە، چەند کاتژمێرێک لەمەوبەر، گاڵتەی نەک هەر بە نیشتمان، بەڵکوو بە هەرچییەکیش دەکرد کە تێیدا دەژی.

زۆرجار لەناو هاوڕێکانماندا دەبینین، یەکێکیان هەر کە خاتوونێک، یان چەندخاتوونیکی بینی، تەواوی جموجووڵەکانی دەگۆڕێت. دەتوانین بڵێین لەو بارودۆخەدا، تەنانەت بیرکردنەوە و لۆژیکیشی دەگۆڕێت. لەوانەیە پێشتر دوژمنی سەرسەختی ژنان بووبێت کاتێک لێیان دوورە، کەچی کە نزیکیان بوویەوە، ببێتە یەکێک لە بەرگریکارە سەرسەختەمانی مافی ژنان و، بانگەشەی ئەوە

بکات کە پێویستە ژنان یەکبەیەکی مافەکانیان بەدەست بخەن.

زۆرجاریش دەبینین خەڵکی خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن. خۆ ئەگەر پەیدۆزی بۆ بابەتەکەیان بکەین، تێدەگەین کە لەو کاتەدا لەناو بەرگی یەکێک لە کەسایەتییەکانیدا بووە لەناو چەند کەسایەتییەکەدا کە هەیەتی، کاتێکیش دەچنە ناو کەسایەتییەکی دیکەوە، دەبینین قسەیەک دەکەن کە دژی قسەکەی پێشتریان ڕادەوەستێتەوە بەبێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن.

هەموو یەکێکمان هەست بەو گۆڕانکارییە دەکەین کە لە بیرکردنەوەیدا ڕوو دەدات: مەسەلەن بەیانی لە ماڵەوە دێتە دەرێ بەرەو کارەکەی، شەویش دەچێتە قاوەخانەیەک یان مەیخانەیەکەوە. ئەو لە فەرمانگە، بێجگە ئەو کەسەیە کە لە ماڵەوەیە و، لە ماڵەوەیش کەسێکی جیاوازترە لەوەی قاوەخانە. لەسەر ئەم نەریتەیش بە شێوەیەک ڕاهاتووە، لە بینینی دژیەکییەکانیدا قورپەسەرە دێتە پێکەنین.

بە شێوەیەکی سروشتیش، مرۆڤ تووشی نامۆیی نابێت کاتێک ئەو پێکدژیانە "تەناقووز" لە خۆیدا

دەبینێت، بەڵام تووشی سەرسوورمانی تەواوەتی دەبێت ئەگەر لە کەسێکی دیکەدا هەستی پێ بکات.

بەڵێ! تووشی سەرسوورمان دەبێت کاتێک دەبیستێت ئەو مۆسۆلینییە ستەمکارە دیکتاتۆرە، ئەوەی کە ئیتالیای خستبوویە بەر ڕەحمەتی ئاگر و ئاسن، کەچی لە ماڵەوە، منداڵە بچووکەکەی هەچەهەچەی پێ دەکات. یاخوود کاتێک دەبیستێت ملهوڕێک لەو ملهوڕانەی مێژوو، ماڵەقوڵەی دەستی ژنەکەی بووە و چەشنی بووکەڵە چۆنی ویستووە، بەکاری هێناوە.

بۆیە، مرۆڤ ئەو بوونەوەرە نییە کە بیریارە کۆنەکان باسیان لێوە کردووە و وێنایان کردووە: گوایە مرۆڤ چونکە بوونەوەرێکی عاقڵە، ئەوا لە سایەی عەقڵەوە دەست بۆ هەر شتێک دەبات کە لۆژیک پێی بڵێت و کێشی بکات، یان ئەوە بکات کە بیرکردنەوەی ڕاستەوخۆ پێی دەڵێت.[26]

میلز مامۆستای زانستی کۆمەڵناسی لە زانکۆی کۆلۆمبیا وا تێدەگات کە: بیرکردنەوە هیچ نییە

---

[26] - لەوانەیە مەبەستی نووسەر لە بیرکردنەوەی ڕاستەوخۆ "التفكير المستقيم" بیرکردنەوەی پەتی بێت لە دوورە لە دەستی کۆمەڵگە و زانیارییە پێشینەکان. وەرگێڕ

بێجگە لە ئەو گفتوگۆ بێدەنگەی نێوان مرۆڤ و ئەو کەسەی کە بە خەیاڵ لەبەردەمی خۆیدا دایدەنیشێنێت. ئەو کەسەیش کە مرۆڤ بە خەیاڵ لەبەردەمی خۆیدا دایدەنێت و دەیدوێنێت، بریتییە لەو کۆمەڵەیەی کە خۆیشی سەر بەوانە. بە گوزارشتێکی دیکە، ڕۆڵی ئەو کۆمەڵە دەبینێت کە لەو کاتەدا مرۆڤەکە بەرگی ئەوانی لەبەر کردووە.

تۆ ناتوانیت بنووسیت، وتار بدەیت یان وێنای کەسێکی حەقیقی یاخود خەیاڵی بکەیت کە لە بەردەمتدا ڕاوەستاوە و ئەوە هەڵدەسەنگێنێت کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە... کەواتە تۆ لەبارەی هەندێک بیرۆکەوە قسە دەکەیت و هەندێکیان بە باش و هەندێکیشیان بە خراپ یان نەگونجاو دەزانیت. بەڵگەیشت بۆ هەموو ئەم شتانە، ئەو ڕەقیبەیە کە خۆی لەو کۆمەڵەدا نیشان دەدات، یان ڕاستتر وایە بڵێین: ئەو کەسایەتییەتە کە وێنای هەستی ئەو کۆمەڵە دەکات.

هەر لەم سۆنگەیەوە دەتوانین ئەو ئەنجامگیرییە بکەین کە لۆژیکی مرۆیی، لۆژیکێکی گشتی و ڕەها نییە، بەڵکوو ڕێژەییە؛ هەر کۆمەڵێک، لۆژیکێکی خۆی هەیە کە بۆی دەگەڕێتەوە. بۆیە تۆ لە

چوارچێوەی لۆژیکی ئەو کۆمەڵەدا کە دانەیەکی لێیان، بیر دەکەیتەوە. بۆیە، دژیەکی لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا، هێندەی ژمارەی دەروونەکانە و ئەوەیش بابەتێکە نکۆڵی ناکرێت. لەوانەیشە لە زۆربەی کاتەکاندا دەردێکی بێدەرمان بێت.

لە ڕاستیدا، پێوەرە و یاساکانی بیرکردنەوە، لە چەمک و دەستەواژەکانی کۆمەڵگەوە وەردەگیرێت و، بنەماکانی بەها و نەریتەکانیش هەر لەو ڕووانگەیەوە دادەمەزرێن. زۆر سەختە کەسێک بگرێت و بڕوای لە شتێکدا پێ بهێنێت کە ئەو لەسەر پێچەوانەکەی گۆش کرابێت.

بۆ نموونە: تەماشای ئەو پیاوە بکە کە لەناو کۆمەڵگەیەکی پارێزکاردا گەورە بووە و بڕوای وایە کە حیجاب واتای پاکیزەیی و شەرەفمەندی ژنانە. ئەم کەسە لە عەقڵیدا، حیجاب و شەرەفمەندی پێکەوە گرێ داوە. ئەوەیش بووەتە یاسایەکی لۆژیکی و هیچ گومانێکیشی لەو یاسایە نییە، یاساکەیش دەڵێت: ئەو کچەی کە حیجابەکەی توندوتۆڵ نییە، پاکیزە نییە و، خێزانەکەیشی شەرەفمەند نین. ئیدی ئەگەر دنیایش بدەی بە

کۆڵتدا بۆ بڕواکردن بەم کەسە کە هیچ پەیوەندییەکی لۆژیکی لەنێوان حیجاب و شەرەفدا نییە، ئەوا ئەو هەر ملەجەڕێ دەکات و تۆمەتباریشت دەکات بە دۆگما یان بێڕەوشت.

ئەو، شتەکان، یان شیاو و نەشیاو لەژێر ڕۆشنایی ئەو نەریتانەوە پۆلپۆل دەیکات کە کۆمەڵگە بە گوێیدا چپاندوویەتی. ئیدی ئەو جوابە جەنگی لۆژیکییەی کە پێچەوانەی ئەوەیە کە لەسەری ڕاهاتووە، هیچ دەردێک دەرمان ناکات. ڕەنگە لەبەر ڕێز یاخود ترس، هاوڕا خۆی نیشان بدات، بەڵام هەر لەسەر ڕایە کۆنەکەی دەمێنێتەوە کە لەسەر دیواری دڵ و دەروونی دەقی بەستووە. ئەم کارەیش ناگاتە ئەنجام مەگەر لەو کاتەدا کە پەیوەندیی بکات بە کۆمەڵێکی دیکەوە و دەروونی ببێتە ئاوێنەی وێنەکانی ئەوان و، ئەم جارە بە بای ئەوان بکەوێتە سەما.

ئامادەبووانی بەڕێز! ئاوەز و عەقڵی مرۆڤ، چەشنی ڕادیۆیە، تۆ ناتوانێت گوێ لە شەپۆلێک لە شەپۆلەکان بگریت، مەگەر ئەو کاتەی کلیلەکە بخەیتە سەر شەپۆلە دیاریکراوەکە. ئاشکرایشە گۆڕینی کلیلەکە و هەلکێش و داکێشکردنی بۆ

ئەوەیە کە ڕێکخستن و یەکسانییەک لەو نێوەندەدا، لەنێوان نێرەر و وەرگردا دروست ببێت. عەقڵی مرۆڤیش ڕێک بەم شێوەیە کار دەکات، ئەو ناتوانێت لە گفتوگۆ تێبگات، یان بڕوای پێ بکات، مەگەر ئەو کاتەی لەگەڵ یاسا لۆژیکییەکانی ناوەوەی ناو دەروونیدا یەکسان و گونجاو بێت.

زۆرجار خەڵکی بە یەکدا هەڵدەشاخێن، یان تەماح دەکەنە ماڵ و حاڵی یەکدی و دڵیشیان ئارام و ئاسوودەیە. وەک ئەوەی ئەو ستەمەی کە کردوویانە، جیهاد و تێکۆشانێک بێت لەپێناو خودای گەورە و ڕێگەی ڕاستیدا... وەک ئەوەی خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن...

زۆرجاران دەبینین کەسێک یەکپارچە زەحمەت و مەینەتە بۆ دەوروبەرەکەی، خوێنڕێژ و پاوانخواز و شەقوەشێنە، کەچی هەر ئەو کەسە، لە شوێنێکی دیکەدا دەبینینەوە، دەتلێتەوە بەدەم ئازاری بیستنی قووزەقووزی سەگێکەوە، یاخود نرکە و ناڵەی نەخۆشێکەوە.

وێژان، لەم شێوەیە، بە تەواوی چەشنی ئەو عەقڵەیە کە لە لایەن کۆمەڵەوە دروست دەبێت.

مێرخاسێکی پاکی چاک لەناو کۆمەڵەکەی خۆیدا، دەکرێت ببێتە ئەژدیها لە دژی کۆمەڵەیەکی دیکە.

بەڕێزان خۆشەویستان:

بەم شێوەیە دێینە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەمان لەسەر کەسایەتی مرۆیی بە شێوەیەکی گشتی. ئینجا قسەکانمان کۆ دەکەینەوە و دەڵێین: کەسایەتی مرۆڤ، هەر بە عەقڵ و ویژدان و نەفس و چاو و هەر شتێکی دیکەیشەوە، لە وێنە گشتییەکەیدا هیچ نییە جگە لە دروستکراوێک لە دروستکراوەکانی کۆمەڵگەکەی کە تێیدا گەشە و نەشەی کردووە. دەشتوانین بێژین: کەسایەتی، وێنەیەکی بچووککراوەی کۆمەڵگەیە، یان وەک ئەوەی "دۆسن و کیتز" دەڵێن: هاووێنەی ئەو شارستانییەتەیە کە تێیدا گەورە بووە.

هەر لەم سۆنگەیەوە کە دەبینین ئەو کەسانەی لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا پێدەگەن، لە چەند تایبەتمەندییەکدا هاوبەشن کە دەبێتە هۆی جیاکردنەوەیان لە کەسانی کۆمەڵگەکانی دی. بەڵێ، سەرەڕای ئەو جیاوازییانەی کە دەیبینین لەناو کەسەکاندا، کەچی چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەش هەن کە زۆر بە ئاشکرا لە ئەوانی دیکەیان جیا

دەکاتەوە و، کەسایەتییەکی ڕوونیان پێ دەبەخشێت.

هەر لە دێرین زەمانەوە، بیریارەکان مێشکیان بۆ ئەم شتە چووە، هێشتایش لێکۆڵینەوەکان لەو بارەیەوە بەرقەرارن تا بزانن چ شتێک ئینگلیزێک لە فەڕەنسییەک جیا دەکاتەوە، ئەڵمانییەک لە ئیتالییەک، یان مەکسیکییەک لە ئەمریکییەک و... هەتا دوایی.

ئەوەیش بڵێم کە مەبەستم ئەوە نییە کە تاک، هەموو تایبەتمەندییەکانی لەو کۆمەڵگەیەوە وەردەگرێت کە تێیدا دەژی، بێگومان لە قووڵایی دەروونی هەر کەسێکدا، بەشێکی داپۆشراوی دەستەمۆ نەکراو هەیە کە مل بۆ کۆمەڵگە و داخوازییەکی دەوروبەر نادات. هەر ئەمەیشە هۆکاری ئەوەی کە هەر تاکێک لە تاکێکی دیکە بە چەند تایبەتمەندییەک جیا دەبێتەوە، سەرباری گەورەبوونیان لە یەک ژینگە و کەشدا. هەر ئەم هۆکارەیە وای لە "بۆرت و سترن" کردووە، تایبەتمەندییەک بە کەسایەتی ببەخشن و ناوی لێ

بنێن "Peculiarity"، یان ئەو شتەی کە کەسی تێدا هاوبەش نییە.

"مید" کە مامۆستای فەلسەفە بوو لە زانکۆی شیکاگۆ، دەڵێت: لەناو دەروونی هەموو کەسێکدا دوو نەفسی ململانێکەر هەن، ئەو دوانەیش لە ڕێگەی ئەم دوو واژەیەوە دەردەبڕدرێن، یەکەمیان "خۆم" و دووەمیش "من." یان بە شێوەیەکی دیکە، دەروونی کۆمەڵایەتی و دەروونی سروشتی. هەر لەم سۆنگەیەوە دەشێت بوترێت: هەموو کەسێک حەزدەکات لە لایەکەوە مل بۆ یاسا کۆمەڵایەتییان بدات و، لە لایەکی دیکەیشەوە شۆڕشیان بە سەردا بکات.

هەربۆیە، مەسەلەکە وەک ئەوە نییە کە ئەرستۆ دەڵێت: مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە. بەڵکوو ڕاستتر وایە بڵێین: هەم کۆمەڵایەتییە و هەم کۆمەڵایەتیش نییە "لە هەمان کاتدا." ئەو هەڵگری تۆخمی تەسلیمبوونە بە کۆمەڵگە و هەڵگەڕانەوە لێی. بۆیە بە یەکێک لە نەفسەکانی، مل بۆ یاسا کۆمەڵایەتییەکان نەوی دەکات و بەوی دیکەیشیان ململانێ و بەربەرەکانێی لە دژ دەکات.

ئینجا ئێستا ئێمە دەپەرینەوە سەر باسی کەسایەتی تاکی عێراقی، بەو مەبەستەی تایبەتمەندییەکانی دیاری بکەین، مەبەستیشمان ئەوە نییە کە هەر دەبێت هەموو دانیشتووانی عێراق هەڵگری وەها تایبەتمەندییەک بن. زۆرێک هەن کە دەیانەوێت لەژێر بەندوباری ئەو یاسا و نەریتانە دەرپەڕن کە کۆمەڵگە لەسەری دەقی گرتووە.

بۆیە دەبینین کەسانێک هەن، لەسەر پێچەوانەی ئەوە گەورە دەبن کە کۆمەڵگەی لەسەر گەورە بووە.

بەڕێزان، خۆشەویستان:

کۆمەڵگەی عێراقیش وەک هەموو کۆمەڵگەکانی دیکە، چەند تایبەتمەندییەکی هەیە کە بێجگە لە خۆی جیای دەکاتەوە و، کاریگەریش لەسەر پێکهێنانی کەسایەتی دانیشتووانەکەی جێ دەهێڵێت. سەختترین شتیش کە تووشم بووبێتەوە لە ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، بریتی بوو لە دۆزینەوەی ئەم تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییانە و چۆنییەتی کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی کەسایەتی تاکی عێراقی.

بەڵێ! پاش لێکۆڵینەوەیەکی سادە و سەرپێی، گەیشتمە چەند ئەنجامێک، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، دان بەوەدا دەنێم کە تەواو دڵنیا نیم لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانم. هیوادارم ئەم شتانەی من ببنە پاڵنەرێکی باش بۆ توێژەرە عێراقییەکانی دیکە تا لەم بوارەدا پتر ڕۆچن و بگەنە چەند ئەنجامێکی دڵنیاتر و یەکلا کراوە، لەوێیشەوە بتوانین پەردە لەسەر نهێنییەکی دیکەی کۆمەڵگەکەمان هەڵماڵین، ئەو کۆمەڵگەیەی کە بەدەست کێشە و گرفتەکانییەوە دەناڵێنین.

ئـێمە لەم قۆنـاغی دەمـارگیرییەی کە پێیـدا تێدەپەڕین، دەتوانین بکۆڵینەوە لە کەسایەتی گەلی عێراقی و چۆنییەتی گەشەکردنی کەسایەتی تاک تێیدا، ئەمەیش بۆ ئەوەی یەکەم: چۆن بیناسین و دەستی بۆ ببەین، دووەمیش بۆ ئەوەی بزانین چۆن پێ بنێینە بوارەکانی ژیانی هاوچەرخەوە. لە ڕاستیشدا من ئەوە لە بەرژەوەندیی وڵاتەکەماندا نابینمەوە کە بێین و چاو لە ئاستی هەڵە و پەڵەکانیدا بنوقێنین و هەمیشە لە هەوڵی نیشاندانی جوانییەکانیدا بین. ئاشکرایە هەموو کۆمەڵگەیەک عەیب و عاری خۆی هەیە و، هیچ تاک یان کۆمەڵگەیەک نییە لە هەموو شتێکدا گەیشتبێتە پلەی کەماڵ. بۆیە باشتریش ئەوەیە، لەم بارودۆخە ناهەموارەی ئەم سەردەمەماندا، خەم و مشوری عەیب و پەڵە و کەمایەسییەکانمان بین تا بتوانین چارەیەک بۆ دەردی گرانمان بدۆزینەوە، لەبری ئەوەی خەریکی هەڵگوتن بین بە فەزیلەتەکانماندا، بە شێوەیەک کە لەم بارودۆخەدا تەنیا کەسی لەخۆبایی سود وەردەگرێت.

پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ، بۆم دەرکەوتووە کە کەسایەتی تاکی عێراقی دووفلیقانەییەکی تێدایە، سەرەڕای ئەوەیشی کە

تەواو دڵنیا نیم لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەک پێشتریش وتم، بەڵام نیشانەی زۆریشم بەدەستەوەن کە پشتگیری بیروبۆچوونەکەم دەکەن.

ڕەنگە هەندێکتان تووشی سەرسوورمان ببن لەم قسەیە لەبەر ئەوەی هەندێک جار هەست بەو دووفلیقانەییە ناکەن کە من باسی دەکەم. بەڵام لەڕاستیدا، زۆرینەمان لەو دووفلیقانەییەی تێدایە، ئیدی کەم و زۆری کەوتووە. بەڵام چونکە لە ناویدا گەورە بووین و پێی ڕاهاتووین و، بووەتە شتێکی ئاسایی لامان، بە چاوێکی سادە و ساکارەوە تەماشای دەکەین، وەک ئەوەی هەر هیچ نەبووبێت و شتێکی سروشتی بێت.

من نکۆڵی ئەوە ناکەم کە دیاردەی دووڕوویی بوون لە کەسایەتیدا، دیاردەیەکی هەر کۆنە و هەر لە ڕۆژی بەرێ، سەرەتای بوونی مرۆڤەوە هەبووە، بەڵام من دڵنیاتان دەکەمەوە کە دووڕوویی لە دەروونی خۆماندا قوڵپ دەدات. تاکی عێراقی لە هەمووان پتر بانگ بۆ نموونەی باڵا دەدات لە وتار و نووسین و قسەکانیدا، کەچی لە واقیعدا زۆر لێی لا دەدات و پێشێلی دەکات.

ڕۆژێکیان، لە یەکێک لەو وڵاتە عەرەبییانەوە، نووسەرێک سەردانی کردین، ئەودەم مانگی ڕەمەزان بوو، سەری لە پابەندبوونی ڕووالەتیمان بە ڕۆژووەوە سوور مابوو، ئەوە لە لایەک، لەلایەکی دیکەوە سەری لەو گشتە خەڵکە سوڕ مابوو کە بەڕۆژوو نەبوون. لەوانەیشە زیادەڕۆییمان نەکردبێت ئەگەر بڵێین: موسوڵمانی عێراقی لە هەمووان توندترن لە بینینی دیاردەی بەڕۆژوونەبوونی ئاشکرادا، ئەوەی کەسێک بە ئاشکرا لە بازاڕدا شت بخوات. هەروەک چۆن دەتوانین بڵێین: تاکی عێراقی، یەکێکە لەوانەی کە زۆر نیشتمانەکەی خۆش دەوێت، زۆریش زانستخوازە.

لەڕاستیدا، ئەو ئامادەی هەڵاتنە لە خزمەتکردنی زانست و زانیاری ڕێک لەو کاتەی کە کاتی خۆیەتی. کەمترین وابەستەییان هەیە بە ئاینەوە، زۆرترین ڕۆچوونیشیان لەبارەی مەزهەبگەراییەوە هەیە. دەبینیت لە لایەکەوە مولحیدە و لە لایەکی دیکەیشەوە مەزهەبچی.

عێراقییەک دەبێتە شەرارەی ئاگر و دادەگیرسێت ئەگەر بینی یەکێک خەریکە بنەماکانی دادپەروەری

و سۆز و خۆشەویستی پایماڵ دەکات، کەچی دەبینین خۆی لە هەمووان خێراتر پەلاماری کەسانی دیکە دەدات و حەرام بۆ خۆی حەڵاڵ دەکات. ئەگەر زانی بارودۆخەکە لەبارە ئیدی بە کەیفی خۆی دەبڕێت و دەدورێت.

ئەو بەم کارەی، کەسێکی دووڕوو، یاخوود ڕووپاماکار نییە، وەک ئەوەی هەندێک کەس ناوی لێ دەنێن. بەڵکو لە ڕاستیدا ئەو خاوەنی دوو کەسایەتییە، ئیدی بە یەکێکیان کارێک دەکات و بیری دەچێتەوە کە تۆزێک لەمەوبەر بەوی دیکەیان چی کردووە. ئەو بانگەشەی نموونەی باڵا و بەها بەرزەکان دەکات، لە قسەکەیشیدا دڵسۆزە و، لە بانگەشەکەیشیدا جددییە.

بەڵام ئەگەر دواتر شتی پێچەوانەی ئەوەی لێ دەرکەوت، ئەوە هۆی دەرکەوتنی دەروونەکەی دیکەیەتی کە نازانێت دەروونەکەی پێشتری چی وتووە و چی کردووە. بۆ نموونە ئەو باسی بایکۆتی کاڵای یەهودی دەکات لە کۆبوونەوە و ئاهەنگەکاندا، کەچی هەر کە پێی نایە بازاڕەوە و، دەستی کرد بە شت کڕین، خێرا بیری دەچێتەوە چی وتووە. ئەگەر کەسێکی لێ تاین بێت و لێی

بپرسێت: ئەرێ ئەو شتانەی دەستت سەهێنین یان نا؟ خێرا توورە دەبێت.

جارێکیـان لە بەغـداد، کۆڕبەنـدێکی گەورە گیـرا لەبارەی بایکۆتی کاڵای بیانی. وتاربێژەکان وتاری باق‌وبریق و شاعیرانیش شیعری بەگوڕوتینیان تێدا خوێندەوە. خۆشی لەوەدا بوو، زۆرینەی وتاربێژ و شاعیرەکان پۆشاکی بیانییان پۆشیبوو. پەنام هەر پەنای خودایە.

بەو شـێوەیە دەتـوانین چەنـدین نمـوونەی جۆراوجۆر بۆ پشتگیری ئەو قسـەیەمان بهێنینەوە لەبارەی دووڕوویی کەسایەتی تاکی عێراقییەوە.

بـۆ لێکـۆڵینەوە لەبـارەی هۆکـاری ئەو دووڕووییەوە، دەکرێت سـەرنج بخەینە سـەر سێ لایەنەوە، یـاخوود لە سـێ گۆشـەوە تەماشـای ئەم بابەتە بکەین:

یەکەم: لە ڕووی شارسـتانییەوە، دووەم: کۆمەڵایەتی و سێهەمیش لایەنی دەروونی. ئەوجا با سەرەتا لە لایەنی شارستانییەوە دەست پێبکەین:

سـەیری خـۆش لەوەدایە، عێـراق یەکـێکە لەو وڵاتـانەی کە زۆرتـرین نزیکیـی لە بیابانشـینی و

شارســـــتانییەتەوە هەیە پـــێکەوە. لانـــکەی شارســـتانییەتێک بـــووە کە ئێســـتا بە یەکێـــک لە کۆنترین شارســـتانییەتەکانی مرۆڤایەتی دادەنرێت. لە چیـــرۆکە ئایینییەکانیشـــدا وێـــژراوە: باوەئـــادەم سـەلامی لەسـەر بێت، لە باشـووری عێراق ژیاوە؛ ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکـی دیکەیشـەوە دەبینـین ئەو شـوێنە کەوتـووەتە قەراغـی بیابـانەوە، واتە هەردوو شتەکەی تێدا کۆبووەتەوە.

ڕاسـتە لە سەرانسـەری زەویـدا بیابـانی فـرە و فـراوان هەن، بەڵام ئەم بیابـانەی خـوارووی عێراق تایبەتمەنـدی خـۆی هەیە. ئەوێ لە کۆنـدا فرەئـاو و سـەر بە ڕزق بـووە. هەر بۆیەیشـە خەڵکێکی زۆری لـێ نیشـتەجێ بـووە. بەڵام پـاش چـاخی چـوارەمی سەهۆڵبەندان "عصر الجليدی الرابع،" ڕێژەی باران کەمبـوویەوە و ڕێـژەی ئـاو دای لە کـزی و، ئیـدی دانیشـــتووانەکەی بەرەبەرە کۆچیـــان کـــرد و بەملاولادا پەرتەوازە بوون.[٢٧]

عێراقیش زۆرترین پشکی ئەم کۆچەی بەرکەوت. لەوەو پاشـــیش شارســـتانییەتی کشـــتوکاڵێکی ســـەرنجڕاکێش ســـەری هەڵـــدا کە وای کـــرد

---

[٢٧] -Jamali, the new Iraq, P.١٧, IS

بیابانن‌نشینانی دیکه و کێونشینان و ڕۆخی ڕووبارنشینان کۆچیان کردووه بۆی.

ئەگەری زۆر زۆرە عێراق لانکەی یەکەم دەوڵەتی مێژوو بووبێت. لانکەی هەڵگیرسانی یەکەم دەوڵەت بە شێوەیەکی گشتی. وەک **ئۆبنهامەر** دەڵێت: بریتی بوو لە هێرشی بیابانن‌نشینان بەسەر گوندنشینیاندا و بەرزەفتکردنیان.[28] بۆیە دەتوانین بڵێین: عێراق لە یەکەمین نیشتمانەکانی سەرزەوییە کە چینایەتی تێدا دەرکەوتبێت، چینی فەرمانڕەوا و چینی فەرمانبەردار، یان بە گوزارشتێکی دیکە: سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو.

ئا ئەم حەقیقەتە شارستانییە، دەستمان گیر دەکات لە ئەنجامێکی زۆر گرنگ و بەبایەخ، ئەویش هەر لە بەرەبەیانی مێژووی شارستانییەتەوە، ململانێی دوو چین هەبووە. لە لایەکەوە شارستانییەتی بیابانن‌نشین و لەلایەکی دیکەیشەوە شارستانییەتی کشتوکاڵ کە ژێردەستەی بیابانن‌شینەکان بوون.

[28] - بەرزەفتکردن: کۆنترۆڵکردن.

بەم بـــۆنەیەوە، لە عێراقـــدا دوو سیســـتەمی فەرمانڕەوایەتی دامەزران. یەکێکیان بڕوای بە هێز و توانـــا و خۆپســـەندی و فیـــز هەبـــوو کە ئەمە تایبەتمەنـــدییەکانی شـــەڕکەری داگیـــرکەرە؛ لە پەنایشـــیدا سیســـتەمێکی دیـــکە کە بـــاوەڕی بە جەورکێشـــان، دانبەخـــۆداگرتن، بـــاج و ملخوســـی هەبوو.

ئەم ململانـــێ شارســـتانییە، یـــان ئەوەی کە لە زانستی ئەنثرۆپۆلۆژیادا پێی دەگوترێت " Clash of Cultures"، کـــاریگەرییەکی زۆر بەرچـــاوی لەســـەر کەســـایەتی تـــاکی عێراقـــی هەبـــووە. تـــاکی عێراقی بەناچاری لە هەردوو سیستەمەکەوە شتی وەرگرتـووە، یـان ناچـار بـووە لاسـایی دوو چینی کـۆمەڵگە بکـاتەوە. چینـی شـەرکەڕی بیابانشـین و جووتیـاری پێخواسـی ملخوسـی دەسـتەمۆ، ئیـدی جارێکیـان بـڕوای بە سـەرکەوتن و نیشـاندانی هێز هەیە، جـارێکی دیکەیشـیان بە سـەری شـۆڕەوە ناچـارە شـکاتی جەور و سـتەمی خەڵـکی بکـات کە لێی دەکەن.

جاری وا هەیە دەیبینیت خەریکی سمێڵ بادانە و خـۆی بە پـاڵەوانی حەوت ئیقلیم دەزانێـت، جـاری

وایش هەیە لەتاو بێزاری و بێدەرەتانی و ستەمی خەڵکی، ئاخی وا هەڵدەکێشتێت، ئاسمانی حەوتەم دەهێنێتە لەرز و ئاخ و داخ بۆ نەمانی پیاوەتی هەڵدەکێشێت.

گوێ لە گۆرانییەکانمان بگرن، پڕن لە شکات و خەفەت. هەر لەم بارەیەشەوە دەگێڕنەوە کە یەکێک لەو خوێندکارە عێراقییانەی لە ئەمریکا دەیخوێند و لە ماڵێکی ئەمریکیدا دەژیا، جارێکیان دۆستێکی عێراقی خۆی دێتە سەردانی، کەچی ئەو لە ماڵەوە نابێت، ئەمیش لەگەڵ ژنی ماڵەکەدا دادەنیشێت تا هاوڕێکەی دێتەوە. لەناو قسەکاندا، خاتوونی ماڵەکە باسی کوڕە عێراقییەکە دەکات کە کوڕێکی پاک و چاکە، بەڵام نازانم بۆچی هەر کە دەچێتە گەرماو، دەست دەکاتە گریان و زاری. هاوڕێ سەردانیکەرەکەی سەری لەو مەسەلەیە دەسوورمێت و دەڵێت: مامەوە تا دۆستەکەم هاتەوە، هۆکاری گریان و زارییەکەم لێ پرسی لە گەرماودا، کەچی ئەو وتی: نەخێر، نا نا، من لە حەمام ناگریم، تەنیا گۆرانی عێراقی دەڵێم و هیچی دیکە.

له ڕاستیدا، گۆرانییەکانمان هەمووی شین و زارین. عێراقی لە گۆرانییەکانیاندا دەگرین و لە قسەکانیشیاندا جنێو دەدەن. خەفەت دەخوات کاتێک گۆرانی دەچڕێت، کەچی هەر کەشێکی لەباری بۆ هەڵکەوت، دەبینیت دەستت دەکاتە سنووربەزاندن و پاوانخوازی و جنێودان بە تووڕەییەوە. لەوانەیە هەڵەمان نەکردبێت ئەگەر وتبێتمان، عێراقی ملخوسە ئەگەر ڕووبەڕووی کەسێکی لەخۆی بەهێزتر بوویەوە، ستەمکاریشە ئەگەر ڕوبەڕووی کەسێکی لاواز بوویەوە.

دەگەڕێمەوە و دەڵێم: ئەمە دیاردەیەکی باوە لەناو هەموو خەڵکیدا، بەڵام لە دەروونی تاکی عێراقیدا زۆر بەهێزتر و زەقترە، لەبەر ئەوەی بەها عەربی کۆچەر و کشتوکاڵییەکان هەر لە دێرزەمانەوە لەناو دەروونی تاکی عێراقیدا دووڕوویییان دروست کردووە و تا ئێستایش هەر لە ناخماندا ململانێ دەکەن.

ئەم دووڕووییە زیادی کرد و، بناغەیەکی قایمی کۆمەڵایەتی بۆ دانرا لە سەردەمی عەبباسییەکاندا، لەو کاتەی کە بەغداد بوویە پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی. لەو دەمەدا زۆربەی

زانستە ئیسلامییەکان سەریان هەڵدا و فەلسەفە و لۆژیکی یۆنانیش وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی. خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە لای ئەو بیریارە دیارانەی کە دەستیان لەو بزووتنەوە زانستییە گەورەیەدا هەبووە، ئەوا دەبینین زۆربەیان کوڕی چینی ژێردەستەن. واتە کوڕی شار بوون و کەمترینیان بیابانشین و ڕۆڵەی بیابان بوون.

ئەوەیش مانای وایە کە هەر لەو کاتەوە دەزگای بیرکردنەوەمان، بیچمێکی نموونەیی زاهیدانەی ملخوسانەی[29] وەرگرتووە "المثالیە الزاهدە الخاضعە." بەڵام کارەکانمان لەژێر کاریگەری بەها عەرەبەییە کۆچەرییەکاندا مایەوە چونکە بەهای باوی ئەو سەردەمە بوو لەناو چینە باڵاکاندا. ئیدی لەوێوە ئێمە لەناو دوو جیهانی دژیەکدا دەژین، یەکێکیان جیهانی بیری نموونەییە و، ئەوی دیکەیشیان، جیهانی کرداری واقیعییە.

بۆخۆی کار گەیشتە ڕاددەیەک، یەکێکمان لەسەر بنەمای لۆژیکی ئەرستۆتالیس کە بنەمایەکی نموونەیی ئایینییە، موناقەشەی دەکرد، کەچی خۆی لە واقیعدا ڕۆڵەی دنیایەکی پڕ لە قین‌وڕق بوو.

---

[29]- ملخوس: ملشۆڕ

مایەی سەرسوورمان ئەوەیە کە لەناو ڕۆشنبیر و پیاوانی ئاینییشدا ئەو دووڕوویی کەسێتییە دەبینین زۆر بە ئاشکرایی: ئەو تاوێک باسی نموونەی بالات بۆ دەکات و بە هەر کەسێکدا دێتەوە کە پێچەوانەی ئەوە بجوولێتەوە، تاوێکی دیکە دەست دەکات بە پاوانخوازی و دەستدرێژی، ئیدی بە هۆی هەر هۆکار و پاڵنەرێکەوە بێت تووڕە دەبێت و لە قەبری دایکی ئەو نموونە بالایەیش دەبات کە نیو کاتژمێر لەمەوبەر بانگ و سەلای بۆ دابوو.

سوتفەی سەیر لەوەدایە، سەرزەمینی عێراق، لە سەردەمی ئیسلامدا لانکەی زۆرێک لە کەسە گرنگەکانی هزری ئیسلامی و فەلسەفە و لۆژیک بووە. ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا "درودی خودای لەسەر بێت" لەوێ ژیاون، موعتەزیلەکان لەوێ سەریان هەڵدا، جەمسەر تەسەوفییەکان زۆرێکیان لەوێ پێیان گرت، هەروەک چۆن ئیمامەکانی ئیسلام بڕێکیان لەوێ ژیان.

ئەو زانا و ئیمام و کەسە دیارانە، سروشتی (هزری عێراقی)یان بە شێوەیەکی نموونەیی

داڕشتەوە و، ئەخلاقی فازیلەیان شکۆدار کرد. ئیدی تاکی عێراقیش لەسەر ئەوە ڕاهات کە وتار و نووسین بە شێوەیەک بنووسێت کە ئاین و لۆژیک و هزری باڵا داوای لێ دەکەن، بەڵام بەداخەوە نەیتوانی تۆزقاڵێک لە ژیانی ڕۆژانەیان بگۆڕێت. هەر بۆیە تاکەکان دوو کراسیان لەبەر خۆیان دەکرد، یان دەبوونە کەسێکی دوو دیو، یەکێکیان بۆ کاتی بیرکردنەوە و، ئەوی دیکەیشیان بۆ کاتی کارکردن. چەندە مەودایەکی بەرین لەنێوان ئەم دوو کەسایەتییەدا هەیە.

## بەڕێزان!

لە سەردەمی ئیسلامدا، خەڵکی عێراق بە خەڵکی "شیقاق و نیفاق" ناویان بەناو بوو، هەندێک لە بیریارە کۆنەکانیش هەوڵیان داوە ئەم دیاردەیە شی و شیتەڵ بکەن، یەکێکیش لەوانە **جاحیز** بوو. واتە دەیانویست بزانن بۆچی خەڵکی عێراق ئەهلی شیقاق و نیفاقن؟ بۆچی دەبێت هەندێک سەرکردە بۆ شۆڕش هەڵنێن، کەچی لە سەعاتی سفردا پشتی بەردەن؟

بیریارانی کۆن، هەوڵی شیکارکردنی ئەم دیاردەیەیان داوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، ئێمەیش ئەمڕۆ لە سایەی زانستی کۆمەڵناسییەوە، دەبینین هێندەیش خۆماندووکردنی ناوێت.

عێراقییەک وەک ئەو خەڵکەی دیکە لە ژیانی ڕۆژانەیدا جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو خەڵکەی دیکەدا نییە، ئەویش مەبەستییەتی ناو ناوبانگ پەیدا بکات و گەرەنتی دەست بکەوێت. ئا لەم شتەدا، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خەڵکی دیکەدا نییە. جیاوازییەکە لەو بیرکردنەوە نموونەییەیدایە؛ ئەو بیر لە چەند بنەما دەکاتەوە کە توانای

جێبەجێکردنی نییە؛ پڕ دەداتە ئامانجێک کە بە هیچ کلۆجێک دەستی نایگاتێ. هەربۆیە، دەبینین بە سەرکردەکان دەڵێت: هەستە! ئێمەیش لەگەڵتین، کەچی کاتێک هەڵدەستێت، ئەو لەماڵەوە خۆی بە زەویدا پان دەکاتەوە و سکاڵا لەدەست ڕۆژگار دەکات.

هەر لێرەوەیە وتراوە: دڵگەرمی عێراقییەکان چەشنی ئاگری هاوپەیمانەکان وایە، بە تەواوی داناگیرسێت، دەکوژێتەوە، لەگەڵ نموونەی بالادا تاو دەسێنێت و لەگەڵ واقیعدا کپ دەبێتەوە.

لەوانەیە هەڵەمان نەکردبێت ئەگەر بڵێین: نەزعەی هاوپەیمانی، لە هەموو کۆمەڵگەیەکی دینیدا بڵاو دەبێتەوە کە بنەماکانی ئاین تێیدا بالادەستە و ڕێنماییەکانی تێدا بڵاوە.

تێبینی ئەوەیش دەکرێت، هەر شارێک پیاوانی ئاینی زیاتر بێت، ڕێژەی ئەو دووڕووییەیش زیاتر دەبێت، چونکە خەڵکی لەو شارەدا ناچار دەبن لە دیوێکەوە دینی و لە دیوێکی دیکەیشەوە دنیایی بن.

پیاوانی ئاینی بە گشتی ئەوەیان کردووە بە پیشە، مەسەلەن لەسەر پیشەکەی پاداشت و موچە

وەردەگرێت. بەڵام زۆربەی کات ئەو پادشاتە وا دەکات کەسەکان دوور بکەونەوە لە ڕێنماییە دینییەکان. بۆیە پیاوی ئاینی ناچارە ئەو قسانە بە زارەکی بڵێت و بە کردار پێچەوانەی بوەستێتەوە. سەرەنجامی ئەو کارەیشە کە زۆربەی کات دەکەونە ناو دژیەکییەوە. "ولا حول ولا قوە الا باللە."

خۆ ئەگەر بێین و لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگەی عێراقی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بکەین، کە چەندین سەدە فەرمانڕەوایەتی خەڵکی عێراقیان کردووە، ئەوا بەریەککەوتنێکی زۆر سەیری شارستانی و ململانێی بەهاکان دەبینین. ئاشکرایە کە حوکوومەتی ناوەند لەو سەردەمەدا و بە تایبەتییش لە دوادواییەکاندا بە تەواوی لاواز بووبوو. تەنانەت نەیدەتوانی پشتی ستەملێکراوێک، یان دەستی ستەمکارێک کورت بکاتەوە. ئیش و کاری تەنیا لێسەندنی باج و خەراج بوو لەسەر حسابی هەژار و بەستەزمانان. ئەم دیاردەیەیش بوویە هۆی بڵاوبوونەوەی نەریتی کۆمەڵایەتی لەپێناو پاراستنی ڕۆح و دابینکردنی ئاسایشدا.

ئەو کاریگەرییەی کە ئەم چەند ماوەیەی پێشوو جێی هێشتووە ئەوەیە کە زۆرێک لە شارەکانی عێراق هەوڵی ئەوەیان دا کە خۆیان لەسەر بنەمایەکی عەشایەری ڕێک بخەن و شێخ و گەورەیەک بۆ خۆیان هەڵبژێرن کە داوای شۆڕش بکات... و هەر نەریتێکی دیکەی عەشایەری لەو شێوەیە. ئەمەیش بوویە هۆی بڵاوبوونەوەی نەریتی خێڵایەتی بە شێوەیەکی زۆر زەق. تاکی عێراقی وای لێهات کە هێزی بەلاوە زۆر بەڕێز بێت، زۆر خۆی پێوە با بدات، دەمارگیری بۆ شارەکەی خۆی هەبێت هەروەک چۆن پێشتر خێڵەکییەک بۆ خێڵەکەی خۆی لە بیاباندا هەیبوو.

گوایە دەڵێن: زۆرێک لە سەرکردەی شارەکان، هەوڵی ئەوەیان دەدا ببنە دز و چالاکی شەوانە بکەن لەبەر ئەوەی پێیان بگوترێت "**پیاوی شەو**" بەو بۆنەیەوە، پێگەی پێویستیان لەناو کۆمەڵگەدا دەست دەخست.

من خۆم کۆنەسەرکردەی یەکێک لەو شارانە دەناسم، زۆر دەوڵەمەند و پارەدار بوو، شەوان دەچوو بۆ دزی و بۆ پاڵەوانیتی شەوانە. بەو

بۆنەیەوە خەڵکی ڕێزیان لێ دەگرت و لێی دەترسان.

هەرچۆنێک بێت، بڵاوبوونەوەی ئەم بەها عەرەبییە کۆچەرییانە لە کۆمەڵگەی عێراقیدا، ملۆیەکی نوێی خستە سەر باری دووڕوویبوونی کەسایەتی تاکی عێراقی. ئا ئەو پاڵەوانەی کە شەو کاری خۆی دەکرد، بە ڕۆژ ناچار بوو وەڵامی نموونە باڵا دینییەکە بداتەوە. دەبینین بە ڕۆژدا کراسی ویقار و فەزیلەت لەبەر دەکات و ملی ڕێگەی مزگەوت دەگرێت بەو هیوایەی خوای گەورە بیخاتە بەهەشتەوە و، کارەکانی شەوی بیر دەچێتەوە، وەک ئەوەی نە بای دیبێت نە بۆران؛ وەک ئەوەی ئەو کارانەی کە بە شەودا کردوونی، هیچ پەیوەندییەکیان بە کارەکانی ڕۆژەوە نییە.

## بەڕێزان و خۆشەویستان!

پاش ئەم شرۆڤە شارستانییەی کە جێپێیمان هەڵگرت لە مێژوودا هەر لە سۆمەرییەکان و عەبباسی و عوسمانییەکانەوە، ئێستا دەپەرژێینە سەر شرۆڤەی لایەنە کۆمەڵایەتییەکە. لەوێیش هۆیەکی دیکە دەدۆزینەوە کە بووەتە هۆی دووڕوویی لە کەسایەتی تاکی عێراقیدا.

وتمان گرنگترین هۆکاری بنیاتنەری کەسایەتی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی، هەر ئەو شتەیە کە زانایانی کۆمەڵناس ناویان لێناوە: "کۆمەڵەی سەرەتایی." لە ڕاستیدا ئەو کۆمەڵەیە هەر ئەو شتەیە کە کەسایەتی تاکی تێدا هەڵدەتۆقێت و خۆی لە قاڵبە کۆتاییەکانی دەخزێنێت.

با ئێستایش بێینە سەر ئەو کۆمەڵە سەرەتاییەی کە لە عێراقدا دەیبینین و باسیش لە کاریگەرییان دەکەین لەسەر کەسایەتی تاکی عێراقی. من بۆخۆم لەپاش لێکۆڵینەوەیەکی درێژ لەمەڕ کۆمەڵەی سەرەتایی لە عێراقدا، هەستم بە دیاردەیەکی زۆر نامۆ کرد کە زۆر بە دەگمەن شتی لەو شێوەیە لە وڵاتانی دیکەدا دەبینرێتەوە. ئەوەیش دیاردەیەکە کە

خۆمان هەستی پێ ناکەین چونکە پێی ڕاهاتووین و بە شتێکی ئاسایی دەزانین، بەڵام بیانییەک زۆر بە ئاشکرا هەست بە نیشانەکانی دەکات.

توێژەرێکی بیانی کاتێک تەماشای خێزانێکی عێراقی دەکات، دیاردەیەک هەست پێ دەکات کە دەکرێت ناوی بنێین دیاردەی "بەشبوون،" مەبەستم لە بەشبوون بریتییە لە بەشبوونی شێوازی ژیان لەنێوان پیاو، ژن و منداڵدا. ئەگەر وامان دانا کە خێزان لە سێ توخم پێک دێت، پیاو و ژن و منداڵ، ئەوا دەبینین هەر کام لەم سیانە، لایەنێکی ژیان دەگرن کە جیاوازە لەوەی ئەوانی دیکە.

بواری ژن ماڵەوەیە و ناکرێت خۆی لێ ببوێرێت؛ پیاویش لە کاتی بەتاڵیدا خولخول دەچێتە قاوەخانە و منداڵیش بۆ کوچە و کۆڵان و گەمە لەگەڵ منداڵان.

زۆر کەم دەبینین کۆمەڵگەیەک ئا بەم شێوە ئاشکرایە دابەش بووبێت. عێراق بە قاوەخانەکانی بەناوبانگە. سەرباری زۆری ژمارەکەیشی، کەچی پڕ دەبن لە پیاو. لە چکۆلەترین ئاواییدا، چەشنی شارێکی گەورە قاوەخانەکان بەربڵاون، بەربڵاوییەکی زۆر بەرچاو. لەوانەیە هۆکاری ئەمە،

داپۆشـــراوی ژنـــان بێـــت، ئەوە یەک. دووەمـــیش: پیاوان تاقەتیان نییە لە ماڵەوە لەگەڵیاندا دانیشن.

لای ئێمە چەند بەهـا و نەریتێک پەیدا بوون کە وای کـردووە ژنـان پێگەیەکـی نزمتریـان هەبێت و عەقڵیشـــــیان کەمتـــــر بێـــــت، پیـــــاوان بە خـۆبەگەورەزانینەوە تەماشـــای ژنـــان بـکەن. خـۆ ئەگەر خەڵکی زانییـان فلانەکەس لە مـاڵەوە لای ژن و منداڵەکەی زۆر دەمێنێـتەوە، ئەوا خێـرا بە ژنـانی ناوی دەبەن. نموونەی زۆریش هەن لە ناوماندا کە بـاس لە بڵاوبـوونەوەی ئەم بەهـا کۆمەڵایەتییـانە دەکەن.

لەوانەیە ئەو بەهایانەمـــــان لە بیابـــــانەوە پـــێ گەیشـــتبێت. کـۆمەڵگەی بیاباننشـینیش کـۆمەڵگەی شـــەڕ و تـــاڵانییە. مـــرۆڤ خـــۆی بە تـــاقی تەنیـــا هەڵدەستێت بە جەنگ و تێکۆشـان. ئیدی کـاری ژن کە گـوایە کەمێـک لە خـواری کـاری پیـاوەوەیە، بە چاوی سووک و بێقەدرییەوە تەماشای دەکرێت.

بیاناننشین ناوناتۆرەی "ژنانی" بە هەر کەسێکەوە دەنـێن کە زۆرتـر لە مەجلیسـی ژنانـدا دانیشـێت و تێکەڵیان ببێت. بیاباننشـینیش کەم دەتوانێت بەرگەی هەڵگرتنـی نـاتۆرەیەکی وەهـا بگرێـت، بـۆیە زۆربەی

کاتەکانی لە دیوەخانی شێخدا بەسەر دەبات و گوێ بۆ باسی پاڵەوانی و جەنگ و هەرا دەگرێت.

ئەم خوو و نەریتەیشمان لەو کاتەوە وەرگرتووە کە دیوەخانی بیابان بۆ قاوەخانەی شار گۆڕا. هەر بۆیە پیاو لە ماڵەوە تیکەکەی بە تەواوی قوت نادات، چاکەتەکەی لەبەر دەکات و، چرپەچرپ خۆی دەگەیەنێتە قاوەخانە. بەڵێ! ئەو تەنیا لە کاتەکانی خەو و خۆراکدا پێ دەنێتە ماڵەوە و تەواو.

بەڵام ژن، ڕاهاتووە لە ماڵەوە چوارمشقی بدات لەبەر ئەوەی گوایە شەرەف و پاکیزەیی خۆی نەخاتە گرەووەوە. ئەو هەر لە بچکۆلەییەوە تێگەیەنراوە کە دەبێت خۆی داپۆشێت و لە ماڵەوە دەرنەچێت ئیللان و بیللان بۆ کارێکی گرنگ نەبێت.

من بۆ خۆم شارێکی عێراقی دەزانم، خەڵکەکەی شانازی بەوەوە دەکەن کە لە شەقامەکاندا بە دەگمەن نەبێت ژن نابینرێت. خۆ ئەگەریش یەکێکیان ناچار بوو بۆ کارێکی پێویست وەدەرکەوێت، ئەوا خۆی لە قەرەباڵغی دەپارێزێت نەبادا لەشی داپۆشراوی ببینرێت "خوا نەخواستە."

هەر بــۆیە دەبینیــت مــاڵی عێراقــی بە تەواوی بووەتە جیهانێکی خۆهەڵسوڕێنەر -قائم بذات-، نرخ و بەهــای تــایبەتی خــۆی هەیە و، بنەمــای تــایبەتی هەیە کە بە تەواوی لە جیهــانی پیــاو جیــاوازە. بێگومــان ئەمەیــش یارمەتیــدەرێکی باشــە بــۆ گەشــەکردنی دووڕوویــی لە کەســایەتی ژنــیش و پیاویشدا. دەبینین هەر کام لەم دووانە، کاریگەرە بە بەهــای ڕەگەزی بەرانــبەر، ئیــدی چ بە ئاگــاییەوە یاخود نائاگایی بێت، سەرەڕای بەهای ڕەگەزەکەی خۆیشی. بۆیە دوو سیستەمی دژەیەکی بەهایی لە کەللەیدا چرۆ دەکەن و لق لێدەدەن.

بۆیە لەناو ژن و پیاوەکانماندا ئەو گشتە دژیەکییە بەرچــاو دەکەوێــت کە دەتــوانین زۆر بە جــوانی تێبینییان بکەین. هەموویشی بە هــۆی جیابوونەوەی ژن و پیاوە لە یەکدی.

بــێجگە لەوەیــش، ئەم جیــابوونەوە ڕەگەزیــیە، هەنــدێک جــار ســەری لە لادانــی سێکســییەوە دەردەهێنێتەوە. لە ڕووی زانستییەوە سەلماوە کە لادانی سێکسی شتێکی دەسخراوییە -اکتسابی- و، پتر لەو شوێنانەدا تەشەنە دەسێنێت کە ژنانی لێوە دوورە. وەک حاڵی ئەو سەربازانەی کە ماوەیەکی

زۆر لە بەرەکانی جەنگدا دەمێننەوە. کەشتیوانەکان و دیلەکانی نێو بەندینخانە و، ئەو جێگانەی دیکە کە کەمترین بەرکەوتنیان لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەردا هەیە.[٣٠]

لە عێراقدا ئەو لادانە سێکسییە زۆر بەربڵاوە بە هۆی نائامادەیی ژنانە لە دەرەوەدا. هەربۆیەیشە زۆرێک لە گۆرانییەکانمان بەسەر خۆشەویستی ڕەگەزی نێردایە -ئەو شتەی کە بە دەگمەن لە وڵاتانی دیکەدا دەبینرێت-.

زۆرینەی غەزەلەکانمان بە نەفەسی خۆشەویستییەوە وتراون، ئەوانەی کە سەرکوتکراوێکی وەکوو ئەبوو نەواس دایڕشتوون. بۆ نەگبەتی خۆمان، عێراق یەکەم لانگەی حیجاب بووە لە شارستانییەتی ئیسلامیدا، هەروەک چۆن شوێنی دابەزینی وەحیش بووە بۆ جەنابی ئەبوو نەواس.

خۆشەویستان! ئینجا کەسی لادەری سێکسی، بەردەوام نەخۆشی دووفلیقانەیی لە کەسێتیدا گەشە دەکات. ئەو کەسێکە کە خۆی بە بێجگە لەوەی

---

٣٠ -Elliot & Merrili, Social & Disorganization, p.١٩٧

هەیە نیشـــان دەدات. بەســـتەزمانە ناچـــارە بە شێوەیەک خۆی دەرخات کە لە دڵدا وا نەبێت. هەر بۆیە دوو کەسایەتی بۆ خۆی دروست کردووە. یەکێکیان ئەوەیە کە لەبەردەم خەڵکیدا دەردەکەوێت و یەکێکیشـــیان ئەوەیە کە بە شـــوێن هەوەســـە لادەرەکانیدا دەیکێشێت.

پاش ئەوەی کە لە باسـی ژن و پیـاو بـووینەوە، دێـینە سـەر تـوخمی سـێهەمی خێـزان کە منـداڵە. دەبینین لە کۆڵان وازی دەکات و کەسایەتییەکی بۆ دروست دەبێت.

زانایانی کۆمەڵناس تێبینی ئەوەیان کردووە کە لە ئەمریکا و ئەو بانـدە چەتەییـانەی کە لە شیکاگۆ و بێجگە شیکاگۆیشـدا لە شـارە گەورەکانـدا دروست دەبـن، هۆکـارەکەی چـاودێرینەکردنی منـداڵانە لە هەنـدێک گەڕەکـی هەژارنشـینداا. دەبینرێـت کە زۆربەی بانـــــدە چەتەییەکـــــان لە گەڕەکە هەژارنشینەکاندا دروست بوون. چونکە ماڵەکانیان بچووکن و ناچار دەبن بێنە دەرەوە و کەمێک یاری بکەن لە کۆڵانـدا کە لە ڕاسـتیدا لە دواییـدا لانـگەی بەرهەمهێنانی چەتە گەورەکانە.

سەیر و سەمەری دنیا لەوەدایە، لە عێراقدا، منداڵەکانمان هەر دەچنە درەوە، ئیدی چ ماڵەوەیان گەورە، چ گچکە بێت. ماڵەکانمان لە ڕاستیدا نە درەختێک نە گوڵێک، هیچ شتێکیان تێدا نییە مەگەر بە کەمی. ئیدی منداڵ ناچارە بچێتە درەوە تا شانێک بە بادا بکات و کەمێک تاقەتی بێتەوە سەر خۆی. لەم کارەدا دایکیشی یارمەتیدەرییەتی تا فریای کاروباری ناوماڵ بکەوێت، ئەوە لە لایەکەوە. لە لایەکی دیکەیشەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ دەستەخۆشکە میوانەکانیدا دوو دەمەتەقێ بکات.

ئا بەم شێوەیە دەبینین منداڵانی عێراقی بوارێکی باشیان هەیە بۆ چوونە کۆڵان و، لەوێ، لەگەڵ هاوکۆڵانی و خزم و کەسدا باندێک دروست دەکەن. خۆ ئەگەر ڕۆحی چەتە لە ئەمریکادا تەنیا لە کۆڵانە هەژارنشینەکاندا هەبێت، ئەوا لە عێراق لەناو دەوڵەمەند و هەژاردا وەک یەک تەشەنە و گەشە دەکات.

ئێمە نهێنیمان نەدرکاندووە ئەگەر بڵێین: ئەو نەریتەی لەناو منداڵی کۆڵاندا بەربڵاوە، زۆر لە نەریتی دارستان دەچێت. نەریتێک کە لە هەموو ڕوویەکەوە دەچێتەوە سەر هێز و بازوو، لەگەڵ

چـۆنییەتی بەکارهێنـانی. منـدال لە کۆلانـدا، هەر هەستی خۆهەڵنان بە هێز و بازووەوە دایدەتەنێت، حەز دەکات وا دەرکەوێت. حەز دەکات کۆنترۆڵی شتەکان بکات و ببێتە چەتەی گەڕەک.

خولگەی خۆدەرخستن لە کۆلاندا، لە دەوری دوو چەمسەردا هەڵخول و داخول دەکات، چەمسـەری "بەهێز و بێهێـز." یان بە گوزارشتی سـەر جادە "پاڵەوان و حیزەڵ."

هەمـوو منـداڵێک لە هەوڵ و کۆششـی ئەوەدایە سیفەتی بێهێز لە خۆی دوور بخاتەوە و بە ئازا ناو دەرکات. حەزی لێ نییە کەس بە حیزەڵە و بودەڵە بـانگی بکـات. ئەو پـاڵەوانە و هەوڵـیش دەدات پاڵەوانییەکەی نیشـان بـدات لە هێرشـکردنە سـەر کەسـانی دیـکەدا کە لە لەش و لاردا لە خـۆی بێهێزترن یان خزمی کەمتریان هەیە.

هەروەهـا شـتێکی دیکەیـش لە کەلـلەی منـداڵی کۆلانـدا چـرۆ دەکـات، ئەویـش دەمـارگیرییە بـۆ منــداڵانی گەڕەکەی خــۆی دژمنــایەتی لەدژی گەڕەکەکــانی دیــکە. هەر ئەم دەمــارگیرییەی گەڕەکـاوگەڕەک، دوایـی تەشـەنە دەسـێنێت بـۆ دەمـارگیری تیـرە و هـۆز و شـارچێتی و شـەڕی

مەزهەبی. ئا بەم شێوەیە عێراقییەک گەورە دەبێت و دەمارگیرییەکی توندی لەبارەی دیینەکەیەوە تێدایە، بەبێ ئەوەی بتوانێت ئەسڵی دیین لە فەرعی دیین جیا بکاتەوە.

بەڵام ئەم ڕۆحی کۆڵانچێتییەی ناو سەروکەللەی تاکی عێراقی، زوو دەگوزەرێت و دیار نامێنێت و خۆی لەژێر چەند شتێکی ساختەدا دەشارێتەوە. منداڵی عێراقی لە گەورەییشدا هەر خەریکی باند و باندکاری نابێت وەک ئەوەی لە ئەمریکا دەیکەن چونکە ڕۆحی چەتەچێتی تێدا دادەپۆشرێت هەرچەندە لە عەقڵی ناوەکییدا ڕیشکی داکوتیوە، بەڵام چیدی ئەو خۆی بە پۆشاکی ئەدەب و فەزڵ خۆی دادەپۆشێت و نیشانەکانی ئایینیش دەکاتە گۆبەرۆک و بە خۆیەوە هەڵیاندەواسێت.

ئێمە هەر لە منداڵییەوە منداڵەکانمان ڕادەهێنین کە لەبەردەم گەوراندا بە ویقار و شکۆوە هەڵسوکەوت بکات. بەم شێوەیەیش دوو کەسایەتی تێدا دەنەخشێت: یەکێکیان بۆ کۆڵان و ئەوی دیکەیشیان بۆ بەردەم خەڵکی لە خۆی گەورەتر. دایباب زۆر تانە لە منداڵەکەیان دەدەن ئەگەر خوانەخواستە لەبەردەم گەورەکاندا بێعەیبییەکی لێ دەرکەوێت.

ئەوان دەیانەوێت ئاقڵ و ژیر و بەویقار بێت ئەگەر لەگەڵ باوکیدا چوو بۆ قاوەخانە. بەڵام خۆ هەر کە لە دوورەوە کۆڵانی لێدەرکەوت، خێرا ئەو دەمامکە درۆینەیە تووڕ هەڵدەدات کە لەگەڵ باوکیدا لە دەموچاوی خۆی پێچابووی.

کاتێکیش ئەم مێرمنداڵە گەورە دەبێت، لەسەر ئەو نەریتە ڕادێت کە قسەی بێ کردار بکات، یان دەماری بۆ شتێک هەڵسێنێت کە بڕوای پێی نییە. یاخود ئامژگاریی خەڵکی بکات و خۆی گوێ بۆ خۆی نەگرێت.

ئەو بابایە دەبێتە ڕەخنەگرێکی دەرەجە یەک؛ هەڵەی خەڵکی دەبینێت بەبێ ئەوەی هەست بەوانەی خۆی بکات. بە هیچ شتێکی دیکە ڕازی نییە هەرچەندە ئەو شتە لە کەماڵەوە زۆریش نزیک بێت.

لێرەوە ئیدی دەست لە هۆکاری کۆمەڵایەتی بەردەدەین و دەپەرژێینە سەر هۆکاری دەروونی. ئەم دوو هۆکارەیش: کۆمەڵایەتی و دەروونی، هەرگیز لە واقیع دوور ناکەونەوە. چونکە هەرچی هۆکاری کۆمەڵایەتی هەیە، هۆکارێکی دەروونیشی لەپشتەوەیە، هەروەک چۆن هەرچی لایەنی دەروونی هەیە، لایەنێکی کۆمەڵایەتی لەدواوەیە.

هەندێک لە زانایانی دەروونشیکاری دەڵێن: زۆربەی ئەو ناڕەحەتییەی تووشی دەروونی هەندێک خەڵک دەبێت، هۆکارەکەی ئەوەیە کە خۆیان لە ئاستێکی زۆر بەرز و باڵادا دەبیننەوە... کاتێک یەکێکیان دەخرێتە پلەیەکی بەرزەوە، خێرا وا بیر دەکاتەوە کە خۆی لەو لەپێشترە، مافی ئەوە بچێتە ئەو شوێنەوە. هەرکاتێک نیعمەتێکیشی پێ درا، وا هەست دەکات کە شایەنی لەوەیش زیاترە. بۆیە ئەو هەرگیز چێژ لە خۆشی و شادی نابینێت. بگرە ناڕەحەتی و بێزاری لەناو خەڵکیدا بڵاو دەکاتەوە. تووشی بێهیوایی و داڕووخانیان دەکات بە ڕەخنە بەردەوامەکانی لەسەر هەڵسوکەوت و

جموجوولەکانیـــان، هەرچەنـــدە زۆر ئەخـــلاق و ئاکاریـــان پەســـەندیش بێـت. ئەو کەســـە هەمیشـــە تـووڕەیە... بەردەوام دەمـــاری لاملـی لە کـۆمەڵگە هەســـتاوە. ئەو فەزیـــلەتەی کە حەزی لێـــیە و عاشقییەتی و دەیپەرستێت، دەستی ناکەوێت بەبێ ئەوەی خۆیشـی مومارەسـەی بکـات. بێزیشـی لەو خەڵکە دیتەوە، چونکە وا دەزانێت لە خۆی کەمترن، زۆریش نەک کەم. لەوە کەمترن کە گاڵتەیشیان پێ بکات. خۆپەرستە و دەیەوێت هەوەسە تایبەتەکانی خۆی بەدی بهێنێـت. خـۆی زۆر بە خـوێنەوارتر، لەپێشـتر و بـاڵاتر لەو خەڵـکە دەزانێـت، لە کاتێکـدا لەوانەیە خۆی نەزانترین، حەپۆلترین و سووکترینی ناویان بێت.[٣١]

هەندێک لە لێکۆڵەران ئەم دیاردە دەروونییەی ناو هەنـدێک کەس دەگەڕێنـــنەوە بـــۆ درێـــژەی ئەو مـامەڵەیەی کە بـاوک و دایکـی خۆیـان لێیـان داوا کردوون ئەو کاتەی منداڵ بوون. **"هەندێک دایک و بـــاوک لە هەمـــوو شـــتێکدا داوای تەواوی لە منداڵەکانیان دەکەن. لە کاردا، لە کرداردا، لە وتاردا دەبێـت تەواو بێـت. لەســـەر بچـووکترین شـت،**

---

[٣١] محمد کامل النحاس، سیکولوجیة الضمیر. ص ٣٨ - ٣٩

لێپرسینەوەیەکی توندی لەگەڵدا دەکەن. وەها تەماشای دەکەن وەک ئەوەی تەماشای کەسێکی پێگەیشتووی تێگەیشتووی دڵ و عەقڵ توندوتۆڵ بکەن."[٣٢]

من بڕوایشم وایە، ئەم جۆرە پەروەردە خەس‌وخۆڵە، لە عێراقدا زیاتر بەربڵاو بووەتەوە. یەک تەماشای خێرای ئەو نەریتە بکرێتەوە کە لە دەرسخانە لۆکاڵییەکاندا پەیڕەو دەکرا و، ئێستایش پەیڕەو دەکرێت، کە لە هەموو عێراقدا بەربڵاوە، ڕاستی ئەم قسەیەمان دەسەلمێنێت.

باوک و دایک پەلی منداڵەکەیان دەگرن و دێنە یەکێک لەو دەرسخانانە و، بە شێخەکە دەڵێن: "**ئەوە منداڵەکەمە، ها بۆ تۆ، تەربیێتی دابدە، گۆشتی بۆ تۆ و ئێسکیشی بۆ خۆم.**"

ئیدی جەنابی شێخ چەندین شت لەسەر ئەو منداڵە دەکات ئەرک، منداڵەکەیش پێویستە سەر کرز بکات بەسەر خوێندن و نووسینەوەکانییەوە؛ فززەی نەیەت؛ بەلای چەپ و ڕاستدا ئاوڕ نەداتەوە. ئەوەی لەمەدا دەرچێت، ئەوا کوڕێکی ئاقڵی

[٣٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو

بەتەربێتە، خوانەکردا ئەگەر کەسێکیان وا نەبن، ئەوە واوەیلا بۆ خۆیان. ئەو کورەخاسە ناچارە ئەو گشتە کەف و کوڵەی دڵی بخواتەوە و، نققە نەکات تا کاتی خوێندن تەواو دەبێت؛ ئینجا کە هاتە دەرەوە، بەسەر هەموو شتێکدا دەنەڕێنێت، پەلاماری ئەم دەدات و شەق لەوی دیکە هەڵدەدات، پاش ئەو گشتە جرت و چەقەنەیە ئینجا کەمێک داخی دلی خۆی بە بادا دەکات و هەواگۆڕکێیەک دەکات پاش ئەو داپڵۆسینەی پێشتری دەرسخانە.

ئا بەم کلۆجە، منداڵ گەشە دەکات و دوو کەسایەتیشی تێدا دروست دەبێت: کەسایەتییەکی ژیری بە ڕەوشت، کەسایەتییەکی سەربەگوبەندی پەلاماردەر. ئەوەی جێگەی سەرنجە، قوتابخانە نوێیەکانیشمان هەر ئەو هەوا کۆنەی تێدا ماوەتەوە: هەوای کپکردن و وسکردنی قوتابی و ئامۆژگاریکردنی کە گوایە دەبێت بەویقار و شکۆ بێت، لە خوێندنەکەیدا زانستخواز و ئەدەبدۆست بێت.

زۆرجاریش داوا لە فێرخوازی بێچارە دەکرێت، ئەوپەڕی ڕێز و ئەدەب نیشانی خوێندنگەکەی خۆی بدات لەژێر ڕۆشنایی ئەو قسەیەدا کە دەڵێت: "هەر

**کەس پیتێکی فێر کردبم، تا مردن کۆیلەی دەبم."**
منداڵ ئا بەم شێوەیە پەرەوەردە دەکرێت: شتانێک لەبەردەم مامۆستادا دەڵێت و دەکات کە لە دەرەوە بە ئەستەمیش توخنیان ناکەوێت.

دەشێت ئێستا پێداچوونەوەیەک بۆ ئەوە بکەین کە تۆزێک لەمەوبەر وتمان لەبارەی کەسایەتییەوە کە **هەوڵێکی مرۆڤە بۆ هاوسەنگکردنی ئەو هەوەسە سروشتییانەی کە هەیەتی لەگەڵ ئەو یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتییانەی کە کۆمەڵگە لە دەروونیدا دەیڕسکێنێت.**

هاوسەنگی نێوان ئەو دوو تەوژمە پێکدژە، تەواو سەختە. زۆرجار مرۆڤ لەو ڕێگەیەدا بۆ ماوەیەکی زۆر تووشی دەستەوسانی دەبێت.

ئەمە ئەو شتەیە کە خاوەنی پڕۆژەی پەروەردەی هاوچەرخ بانگەواز و بانگەشەی بۆ دەکەن کە دەبێت یاسا و ڕێساکان لەسەر قوتابی ئاسان بکرێت، بواریان بدرێتی تا حەزە سروشتییەکانی خۆیان لەناو سنوورێکی دیارکراودا مومارەسە بکەن. توندی پەروەردە و وابەستەکردنی منداڵ، زۆرجار پەل بۆ ڕسکاندنی سیفەتی ڕیابازی و دووڕوویی دەهاوێت. **"منداڵێکی دووڕووی ڕیاباز**

بەرهەم دێت کە شتێک دەڵێت و شتێکی دیکە دەکات. شتێک دەکات کە ئیمانی پێی نییە. بڕوایشی بە شتێکە کە ئەنجامی نادات..."[٣٣]

دەکرێت هەوەسە سروشتییەکانی مرۆڤ وەک ڕووبارێکی دەم بەرەڵا و خووڕ وێنا بکرێت، ئەگەر بە پەنگی بگیرێت، ئەوا پەنگ دەخواتەوە و زەوی زاری دەوروبەر تەفروتونا دەکات. ئەوە واتای ئەوە نییە کە ئێمە دەست لە منداڵ هەڵگرین و ئەوەی دەیەوێت لە هەوا و هەوەس، بە کەیفی خۆی بیکات و ئازادی ڕەهای پێ ببەخشین. هەوەسە سروشتییەکان، زیاتر لە هەموویان دەکرێت کۆنترۆڵ بکرێت لە ڕێگەی سود وەرگرتن لە وزە شاراواکانەوە، هەروەک چۆن دەتوانرێت سود لە ئاڕاستەی ڕووباری خوڕ بکرێت، بەڵکوو ئەوەی پێویستە ئەوەیە: ئێمە لە سروشتی ئەو هەوەسانە تێبگەین و یاسای ڕێوڕەسمەکانی بزانین، هێز و پێزی خوڕپییەکەی درک بکەین، ئیدی ئەو کاتە دەتوانین ئاودێرانی پێ بکەین لە لایەکەوە، کۆنترۆڵیشی بکەین لە لایەکی دیکەوە.

---

[٣٣]- سیکولوجیة الضمیر، ص ٥٤

بۆیە منداڵی عێراقی بەدەست ئەو سزا دانراوانەوە دەناڵێنێت، ئیدی دەیەوێت هەرچۆنێکی کردووە خۆییان لێ ڕزگار بکات لە ڕێگەی لادان و فرت وفێڵەوە. ئەو خۆی بەڕێز و ئەدەب و نموونەی باڵاوە نیشان دەدات وەک ئەوەی مامۆستا و خاوخێزانەکەی داویانە بە گوێیدا، کەچی هەزار بەهانە و تەڵەکە دەهێنێتەوە بۆ خۆی تا خۆی لەو بەندوبارە ڕزگار بکات. ئەو بەرلەوەی خەڵکیی فریو بدات، خۆی فریو داوە.

## بەڕێزان خۆشەویستان!

سەرەڕای ئەم پابەندییە پەروەردەییە، هۆکارێکی دیکەیش هەیە کە وا بکات، نەفسی منداڵ بەرەو هەمان ئەنجام بەرێت: ئەویش هۆکاری جیاکردنەوەی ژنە لە پیاو.

منداڵ ئەو کاتەی باڵغ دەبێت، دەبینێت ژنی لێ دوور خراوەتەوە -"ئەم شتە بۆ ژنیش ڕاستە کە دەبینن پیاویان لێ دوور خراوەتەوە." وەرگێڕ-. ئەویش سەری بۆی دەخورێت و حەزی لە تێکەڵییەتی، کەچی ڕێک بە پێچەوانەوە خۆی نیشان دەدات. ناچارە ئەو ئاڵۆشە سێکسییەی خۆی سەرکوت بکات، ئینجا خۆی بە یەکێک لە کەسە پاکدامەنەکان پێناسە بکات و -**گوایە**- هەرگیز حەزی لە نزیکبوونەوە لە ڕەگەزی بەرانبەر نەبووە. وەک پێشتریش وتمان، ئەوە دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی لادانی سێکسی، هەروەها لق لێ دەدات بۆ دیاردەیەکی دیکەیش کە دەشێت ناوی بنێین: لادانی دەروونی.

فرۆید و شوێنکەوتووەکانی لە زانایانی قوتابخانەی دەروونشیکاری، دەڵێن: ئەگەر مرۆڤ

شتێکی زۆرزۆر خۆش ویست، بەلام خۆشەویستی و حەزەکەی سەرکوت کران لە عەقلی ناوەکییدا، ئەوا بۆ هەواگۆڕکێی -تنفیس- ئەو کەبت کرانە، پەنا دەباتە بەر ڕەخنە و تانەدان لە هەمان ئەو شتەی کە خۆشی ویستووە.

تەماشای خوڕەوشتمان بکە لەو کاتەی بۆ شتێک دەمارگیرین، یان وا نیشان دەدەین کە شتێکمان ڕق لێیە و، بەردەوام خەریکی پیتک پێوەنانین، ئەوا زۆرترین گومان لەسەر ئەوەیە کە ئێمە لە عەقلی ناوەکیماندا، مەیلێکی سەرکوتکراومان بۆ ئەو شتە هەیە، هەروەک ئەوەی کە برنارد هارت وتوویەتی.[٣٤]

دەکرێت ئەنجامگیری ئەوە بکەین کە: **ئەو کەسەی بەردەوام لە شتێکدا خەریکی ڕەخنە و توانجی عاتیفییە، ئەوە خەریکە هەوای ورگ بە بادا دەکات لەبارەی حەزە سەرکوتکراوەکانییەوە.** زۆرجاران کاتێک یەکێکمان تانە لە شتی کەسێکی دیکە دەدات، ئەگەر هەر ئەو شتە بدرێت بە خۆی، ئەوا زۆری خۆش دەوێت و بە هیچی ناگۆڕێتەوە.

---

[٣٤]- سلامة موسی، عقلی و عقلک، ص ٥٧

ویلز دەڵێت: ئەوانەی کە خۆیان سوور دەکەنەوە لەسەر تێکەڵاوی کەنار دەریاکان، یان دژی پۆشینی هەندێک جۆر پۆشاکی ئافرەتانەن کە لەگەڵ ئابڕوودا ناگونجێت بە حسابی خۆیان، ئەوانە کەمترینی ئەو کەسانەن کە بتوانن جڵەوی هەوەسی خۆیان بگرن عاقڵانە. بە گشتی کەسانێکن کە ئارەزوو و ئالۆشەکانیان سەرکوت کراوە و ئەو پاڵنەرە لە ڕاددە بەدەرانە هەندێک جار تووشی هەوکردن دەکات.

کێشەی سەرکوتکردن، کێشەیەکی هەرە گەورەیە کە تاکی عێراقی بەدەستییەوە دەناڵێنێت، بە شێوەیەکیش کەسایەتییەکەی ئاڵۆز دەکات کە گاڵتەی پێ نەکرێت.

تاکی عێراقی ناسراوە بە ڕەخنەگرتنی زۆر بێجگە لە خۆی. خاتوونێکی ئەمریکی کە سەردانی عێراقی کردبوو، دەڵێت: عێراقی بێوێنەیە لە دەرخستنی عەیب و عاری کەسانی دیکەدا و، زۆر بەتوانایە لە وتنیشی بە گوێگراندا دانەبەدانە. لە ڕاستیدا هەر تاکێک لە ئێمە ڕەخنە بێجگە لە خۆی دەگرێت، هەر کەس لە ئێمە، کاولبوونی نیشتمان دەخاتە سەر ئەوانی دیکە، بەبێ ئەوەی بیری بێت کە لە

نیشتمانەکەدا خۆیشی تاکێکە و پشکی هەیە، ئیدی چ کەم، چ زۆر. فرمانبەرانی دەوڵەت، ڕەخنە لە دەوڵەت دەگرن وەک ئەوەی دەوڵەت لە کەسانێک بێجگە لە خۆیان پێک هاتبێت. هەر کەس دەگریت، ڕەخنە لە خەڵک دەگرێت وەک بڵێین خۆی یەکێک نەبێت لەو خەڵکە.

لە ڕاستیشدا هەر کامێکمان بگرین، دەردەدارن بەو دەردەوەی کە ئەوانی دیکەیشمان پێوەی دەناڵێنین. فەرمانبەرێکی خوارەوە، ڕەخنە لە فەرمانبەرێکی سەرەوە دەگرێت کە بۆچی واستە دەکات، کەچی خۆیشی لە سنوورێکی تەسکتردا دەیکات. کاری هاوڕێیەکی خێراتر ڕادەپەڕێنێت، دواتریش دەنەڕێنێت و زەمی واستە و واستەکاری دەکات.

کەسێک دەبینیت لە بازاڕدا گلەیی لە گزی و غەیبەت و بوختان و درۆ دەکات، کەچی بیری چووە خۆیشی یەکێکە درۆزنان، بوختانکەران و غەیبەتچییان.

ئەم دیاردە دەروونییە لە عێراقدا، دەکرێت بەوە ڕاڤە بکەین کە لەناو عەقڵی ناوەکیماندا چەند ئارەزوویەکی سەرکوتکراو هەن، لەو ڕێگەیەوە

دەمانەوێت خۆمان خاڵی بکەینەوە و هەواگۆڕکێیەک بکەین.

بۆ نموونە: دیاردەی سەرکوتکرانی سێکسی هۆکاری داپۆشران و نەبوونی ژنانە لە کۆمەڵگەدا. هۆکاری بەکارهێنانی هێز دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەندایەتیکردنەی کە چەندین سەدە لە عێراقدا هەبووە. خەمی ژیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گشتە برسێتی و قات و قڕی و لافاوانەی کە لە کۆندا عێراقی شندڕ بندڕ دەکرد.

ئیدی لێرەوە لە دەروونماندا چەندین گرێ و گۆتاڵ، یان ئارەزووی سەرکوتکراو چرۆیان کرد کە دەیانەوێت لەژێر دەمامکی ڕەخنە و تووڕەبووندا خۆیان دەربخەن.

ڕەخنەگری لای ئێمە، بەلایەوە گرنگ نییە ڕەخنە لە کێ دەگرێت، ئەوەی گرنگە خاڵیکرنەوەی دەروونی خۆیەتی لەو گشتە سەرکوتییە. بە چەپ و ڕاستدا دەوەشێنێت بەبێ ئەوەی مەبەستی لێدان بێت لە کەسێکی دیاریکراو.

بێگومان ئەم دیاردەیەیش، ملۆیەک دەخاتە سەر خەرمانی دووفلیقانەیی کەسایەتی تاکی عێراقی، چونکە زۆربەی کات ڕەخنە لە بەڵگەی لۆژیکی و

بەڵگەی نموونەییەوە سەرچاوە دەگرێت. تاکی عێراقی بە شێوەیەک ڕەخنە دەگرێت و بە شێوەیەکی دیکەیش ڕەفتار دەکات، دژی خۆی دەوەستێتەوە بەبێ ئەوەی خۆی بزانێت.

ئەو هێرش دەکاتە سەرت، جنێوبارانت دەکات، تەنیا لەبەر ئەوەی سنووری نموونەی باڵات کەمێک ڕووشاندووە، کەچی پاش ئەوەی خۆیشی هێز پەیدا دەکات، هەڵدەستێت بە هەمان ئەو شتەی کە لەسەری جنێوبارانی کردیت. ویژدانیشی زۆر ئاسوودەیە وەک ئەوەی نە بای دیبێت نە بۆران.

بەڕێزان، خۆشەویستان!

بەر لەوەی لە لێکۆڵینەوەی هۆکاری دەروونی بیینەوە لە پێکهێنانی کەسایەتی تاکی عێراقیدا، وا پێویستە تەقە لە دەرگای خاڵێکی زۆر گرنگ بدەین، ئەویش مەسەلەی زمانە کە ڕۆڵێکی هەرە کاریگەری لەم مەیدانەدا هەیە.

لە عێراقدا، ئێمە گیرۆدەی دەستی دەردێکین، تەنانەت لە وڵاتانی دیکەی عەرەبیشدا ئەم دەردە هەیە؛ ئەویش بریتییە لەو جیاوازییە گەورەیەی کە لەنێوان زمانی سەرشەقام و زمانی نوسیندا هەیە. ناکرێت ئەو هۆکارە هەر وا پشتگوێ بخرێت لە بابەتی لێکۆڵینەوە لە پەرەسەندنی دووفلیقانەیی لە کەسایەتی تاکی عێراقیدا.

زۆرێک لە زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە زمان دەورێکی کاریگەری لەسەر پرۆسەی بیرکردنەوە هەیە. هەندێکیان وای بۆ چوون کە قسەکردن و بیرکردنەوە یەک شتن. بە شێوەیەک کە بیرکردنەوە، وەک خۆیان دەڵێن: هیچ نییە بێجگە لە زمانێکی بێدەنگ.

تەنانەت هەندێک توێژینەوە لەسەر قورگی مرۆڤ کراون لەو کاتەی سەرگەرمی بیرکردنەوەیە، بینراوە کە بە چەشنێک دەلەرێتەوە وەک بڵێیت نیشاندەری ئەو پەیوەندییە توندەیە کە لە نێوان بیرکردنەوە و زماندا هەن.[35]

ئێمە ڕاهاتووین بە دوو زمان بدوێین: وەک ئەوەی بە دوو شێوە بیر بکەینەوە. ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، هەر بەو زمانە دەدوێین کە باوە و هەمووان پێی دەدوێن، کەچی هەر کە حەفلەیەکمان گێڕا، یان وتارێکمان نووسی، خێرا دەست دەکەین بە نمایش و بە زمانەکەی دیکە "زمانی فوسحا" دەست بە هۆنینەوە دەکەین. ئیدی بەم هۆیەوە ئێمە دوو کراس لەبەر دەکەین، بە دوو شێوەیش بیر دەکەینەوە. ئەم دیاردەیەیش بە شێوەیەک تێماندا بڵاوە، خۆمان هەستی پێ ناکەین و نازانین چەندە بۆ دووفلیقانەبوونی کەسایەتیمان و دەرکەوتنی دژیەکی تێماندا کارای یاریدەدەرە.

زمانی فوسحا، زمانی بورجە عاجییەکانە، زمانی ڕەفعی فاعیل و نەسبی مەفعول و جەڕڕی موزاف و موزاف ئیلەیهییە. ئەم شتانەیش پەیوەندییەکی

---

[35]- ودورث، علم النفس، ص ٦٨٨، ٦٩١

ئەوتویان بە ژیانی ڕۆژانەوە نییە. ژیانی واقیعی، ئەوەی کە زۆرینەی خەڵکی تێیدا دەژین لە کێشە و نەخۆشیدا، مەرفوعبوونی فاعیل و مەنسوببونی مەفعول هیچ دەردێک دەرمان ناکات، نابێتە نان بۆ هەژار و دەرمان بۆ بیمارێک؛ ئەوان زمانێکی ئاسانی زانستییان دەوێت کە بتوانن مەرام و مەبەستیان بگەیەننە بەرانبەر بەبێ لێڵی و ناڕوونی.

زمانی فوسحا لە کەشی بیاباندا سەری هەڵداوە، ئەو کەشەی کە گرنگی بە جەنگ و حەماسەت دەدات. دواتریش خۆی خزاندووەتە کۆشک و تەلاری خەلیفە و ئەمیر و خۆشگوزەرانەکان. ئەوە زمانی حەماسەتە لە سەرەتادا، دواتر زمانی فیز و پۆز و بێکاری.

ئەم زمانە فوسحایە، لەلایەن ئەو کەسانەوە پاس کراوە و، ڕێزمانەکەی دیار خراوە کە ویستوویانە خۆیان لە مەلیک و ئەمیرەوە نزیک بکەنەوە، ڕێک چەشنی گۆرانیبێژان و کەنیزەکفرۆشان.

ئەمیر لە ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیدا، هیچ گرنگییەکی بە زمانی فوسحا نەدەدا، بەڵکوو کاتی تایبەتی بۆ دادەنا پاش ئەوەی لە ستەمکردن لە خەڵکی یان بەرقەرارکردنی دادپەروەری

دەبـوویەوە. هەروەک چـۆن کـاتی تـایبەتی بـۆ گوێگرتن لە گۆرانییە تەڕ وبڕەکان دادەنا.

هەر لەبەر ئەم هۆکـارە، شـیعر و وێـژە بـوونە هونەرەکانی زمـانی فوسـحا -فەرمـی- و، بە گشتی ڕەشەخەڵک هیچ بایەخێکیان پێ نەدەدا. ئەوە تەنیا سـنوردار کرابـوو لەنێـوان ئەو چـوار دیـوارە بەرزانەی کە پڕ بوون لە کەنیزەک.

نمـوونەیەک هەیە لە ژیـانی خوالێخشـبوو، شـێخ خەزعەل، ئەمیـری پێشـووی نـاوچەی مەحـمەڕڕە. ئەو ئەمیـــــرە، هەمـــــو هەوڵ و کۆششـــــێکی، شوێنکەوتنی هەوا و هەوەسی خۆی بوو بە هەموو شێوەیەک. زۆرێک لە شاعیر و وتـاربێژ و وێژەوان و ئەوانەی کە بە زمـانێکی پـاراوی فوسـحا قسـەیان دەکـرد، دەچـوونە لای. ئەوانە شـیعری خۆشـیان بەسەر باڵای شێخدا دەهۆنییەوە، ئینجا دەیانخستە سـەر پێسـتی ئاسـک و، ئینجـا کـۆڵی سـەفەریان دەپێچایەوە و دەهاتنە خزمەت شێخ. ئەو کاتە دوو جیهان هەبـوون لە نـاوچەکەدا، جیهانێکیان جیهانی زمـانی فوسـحا و نمـوونەی بـاڵا و بەهـا بەرزەکان بـوو، جیهـانێکی دیکەیشـیان زمـانی بـازاڕ و کـۆڵان بـوو، زمـانی ئەوانەی بەدەسـت کێشـەی ژیـانەوە

دەتلانەوە و، لەبەر ستەمی شێخ دەیاننالاند -خوا لە شێخ خۆش بێت-.

ئێمەیش ئێستا لە عێراق، بەدەست هەمان دەردەوە دەتلێینەوە. وتاربێژەکانمان، نووسەرەکانمان، وتار و نووسینێک دەخوێننەوە و دەنووسن کە پڕێتی لە ئاوازی شیعری و زەخرەفەی نەحویی کە قورسترین نەحوە خودا دروستی کردبێت.

کەم جاریش لەناو ئەو گشتە ئاواز و شیعرانەدا، چارەسەری کێشەیەک لە کێشەکان دەبینرێتەوە. وتارخوێن بە پلەی یەکەم هێنانی وشەی سەیر و سەمەرەی بەلاوە گرنگە، لەگەڵ مەرفوعکردنی فاعیل و مەنسوبکرنی مەفعول، زۆر زیاتر لەوەی کێشەکانی کۆمەڵگەی بەلاوە گرنگ بێت و وەسفێکی دروستی واقیعەکە بکات.

ئەوەیش مانای ئەوە نییە کە نووسەری ئەم دێڕانە خاڵییە لەم دەردانەی کە ئێستا گلەییان لێ دەکەین. یەک چاوپێداخشاندنەوەی شێوازی ئەم موحازەرەیەی کە من ئێستا پێشکەشتانی دەکەم لە ڕووی نەحو و سەرفەوە، وەڕاستدانەری ئەوەیە کە گشتمان لە هەوادا یەکسانین.

بینیم کە یەکێک لە وتارخوێنەکانی پێش من، سەرکەوتوو نەبووە لە پێشکەشکردنی وتارەکەیدا چونکە بە زمانێکی پاراو نەدواوە: مەبەستم ئەوەیە کە بە زمانی قەواعید و نەحو و سەرف نەدواوە. گوێگری عێراقی بە تایبەتی و عەرەبی بە گشتی ڕاهاتووە بە بەکەمزانینی وتارێک ئەگەر نەڕازێنرابێتەوە، واتە ئەگەر بە شێوەی نەحو و سەرف نەوترێتەوە، هەرچەندە سودی زانستی فرە و فراوانیشی هەبێت. کەواتە ئەوە دەردێکی گشتگیرە کە بە میرات بۆمان ماوەتەوە، ئەوەیش هۆکارێکی گەورەیە لە هۆکارەکانی دووفلیقانەیی کەسایەتیمان.

هەمان کێشەی زمان لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپایشدا هەبوو، بەڵام ئەوان توانییان بەسەر ئەو دووفلیقانەیەدا شۆڕش بەرپا بکەن لە سەرەتای شۆڕشەکەیانەوە. ئێستا جیاوازییەکی وەها بەرچاو لەنێوان ئەو دوو زمانەدا نەماوە مەگەر شتێکی کەم، ئەوەیش جیاوازییەکی سروشتییە لەنێوان قسەکردنی ئاخێوەرێکی ڕۆشنبیر و ئاخێوەرێکی ئاساییدا لە هەموو شوێنکاتێکدا. بەو شێوەیەیش تا ڕاددەیەکی زۆر، دەروونی خۆیانیان پاراستووە لە دووفلیقانەیی.

پوخته:

تاکی عێراقی دەردەدارە بە دەردێکی شاراوەوە کە پێی دەگوترێت: دووفلیقانەیی لە کەسیتیدا. یەکێک دەپرسێت: تۆ چ دەرمانێک بۆ ئەو دەردە پێشنیار دەکەیت؟ هەر ئەوەی کە ئێمە هۆکارەکانی دەردەکەمان زانی، ئیدی دەرمانکردنەکەی کارێکی دژوار نییە و لەوێوە دەرمانەکەی دەدۆزرێتەوە.

لەوانەیە هەڵەم نەکردبێت ئەگەر دەرمانەکان لەمانەدا پوخت بکەمەوە:

یەکەم: لابردنی ئەو پەردەیە بەسەر ژنانەوە و بەرزکردنەوەی بۆ ئاستی پیاو بۆ ئەوەی بەهاکان یەک بخرێن و ژن و پیاو لەیەک بچن و بۆ یەک مەبەست و ئامانج تێبکۆشن.

دووەم: کەمکردنەوەی ئەو جیاوازییە بەرینەی نێوان هەردوو شێوەزاری فەرمی و نافەرمی بە شێوەیەک چۆن قسە دەکەن، ئاوایش بنووسن، چۆنیش دەنووسن، ئاوا بدوێن. واز لەوە بهێنن کە سیبەوەیهی و نەفتەوەیهی دایانهێنا. ئەوە وێڵکەن کە

حەریری و هەمەدانی پێکیان هێنا لە شتی بێکەڵک و بێسوود.

سێهەم: یاریگە و یاری بۆ منداڵان فەراهەم بهێنن بە شێوەیەک کە ژیانێکی خۆش تێپەڕێنن لەژێر چاودێری مامۆستای پڕ پێ بوودا. تێیان بگەیەنن ئەوەی کە ئەمڕۆ لە جیهاندا دەوری هەیە، هێزی تاک نییە بەرانبەر تاک، یان شمشێر بەرانبەر شمشێر، بەڵکوو هێزی زانست و پیشەسازییە کە هەر کەس لەم بوارەدا برمێت، ئەوا لە ساحەی ژیندا ڕووخاوە. ئیدی هەرچەندە بانگەشە بۆ هەق و نموونەی باڵا بکات.

لەگەڵ ڕێزدا. . .

